# عەلییێ حەریری
# و ئەڤ کۆما شعران

عەلییێ حەریری ئێک ژ پێشەنگێن کلاسیکێن کوردە، بەلێ مخابن ژین و سەرهاتییا وی ژی وەکی یا گەلەک زانا و ئەدیبێن کورد ب بەرفرەهی نەهاتییە زانین، و بەحسێ وی ب تمامی د چو ژێدەرێن دیرۆکی یێن کەڤن دا ب بەر چاڤێن مە نەکەفتییە، لەو حەتا نوکە ژی ئەو ب دورستی نائێتە نیاسین، و ئەم نزانین کانێ ئەو ل چ سال هاتییە سەر دنیایێ و ل چ سال وەغەرکرییە، و ل کیڤە و چاوا ژیایە؟ تشتێ ژ وی گەهشتییە مە ب تنێ نێزیکی دەهـ شعرێن کرمانجینە، و چو ددی نە!

**حەریری د مەم و زینا خانی دا:**

ئێکەمین ژێدەرێ ناڤێ حەریری تێدا ب بەر چاڤێن مە دکەڤت ڤەهینۆکا ناڤدارا ئەحمەدێ خانی (مەم و زین)ە، ئەوا ل سالا ١١٠٥ مشەختی (١٦٩٣-١٦٩٤ ز) هاتییە نڤیسین، د جهەکی دا ژ پێشییا ڤێ کتێبێ ئەحمەدێ خانی ناڤێ سێ شاعرێن کورد دئینت، و ئاشکەرا دکەت کو ئەگەر مە (کوردان) ژی وەکی خەلکی خودانەک هەبا گرنگی دابا علم و هۆنەری، و کتێب و شعر و دیوان ل نک وی ب تشتەکی چووبان، ئەز ب شعرا خۆ دا حنێرێن مەزن کەم:

**مـن دێ عەلـەما کـەلامێ مـەوزوون**
**عـــالی بکـــرا ل بـــانێ گـــەردوون**
**بیناڤـــە روحـــا مـــەلێ جـــەزیری**
**پـــێ حـــەی بکـــرا عـــەلییێ حـــەریری**
**کەیفـەک وە بـدا فـەقیهێ طـەیران**
**حـەتتا ب ئەبـــەد بمـــایی حـــەیران**

ب ڤێ گۆتنا خۆ ئەحمەدێ خانی ل بەر مە ئاشکەرا کر کو ئەڤ هەر سێ شاعرە بەری وی ژیاینە، و چونکی تشتەکێ مەعلوومە ل بەر مە کو خانی پتریا ژییێ خۆ د نیڤا دویێ ژ سەدسالا یازدێ مشەختی (هەڤدێ زایینی) دا قەتاندییە، ئەم دشێین ب پشتڕاستی ڤە بێژین، هەر چو نەبت دیرۆکا جزیری و حەریری و تەیران بۆ سەدسالا یازدێ و بەری هنگی دزڤڕت، و ژ بەر کو دیرۆکا جزیری و تەیرانی چەندەکێ ل بەر مە یا ئاشکەرایە، دمینتە ل وێرێ ئەم ل دیرۆکا حەریری بگەڕێین.

**ژابا و دیرۆکا عەلییێ حەریری:**

هەر چەندە خانی ئێکەمین کەسە ئیشارەت دایە ناڤێ حەریری، و کو ئەو ئێک ژ شاعرێن کورد یێن مەزنە، بەلێ پا خانی چو ئیشارەت نەداینە دەمێ ڤان شاعران، و چو زانین ژی ل دۆر وان نەداینە، و پشتی خانی ب پتر ژ (١٥٠) سالان ئێکەمین کەسێ ئیشارەت دایە حەریری و هندەک زانینێن کورت ژ دەم و جهێ وی داینە مە ڕۆژهەلاتێ ناڤدار ئالێکساندەر ژابا

بوو، و ژ تشتێن ئاشکەرایە کو ژابایی پتربیا زانینێن خۆ ل دۆر شاعرێن کورد ژ هەڤالێ خۆ مەلا مەحموودێ بایەزیدی وەرگرتینە، ژابا د کتێبکەکا خۆ یا بچویک دا ئەوا ب ناڤێ (ریسالەیەکە د بەحسا شاعر و موصەنفێد کوردستانێ) هاتییە بەلاڤکرن، بەحسێ هەشت شاعرێن کورد دکەت یێن شعر ب کرمانجی نڤیسین، و شاعرێ ئێکێ ژ وان عەلییێ حەریرییە، و دەقێ گۆتنا ژابایی ئەڤەیە: ((شاعرێ بەرێ عەلی حەریرییە، دیوانچەیەک هەیە، شعر و قەصاید، حەریر ژی گوندەکە و جهێ و ناحیەیا شەمزدینان د سنجاخێ حەکارییان دا و شعر و ئەبیاتێد وی ژی د نیڤ کوردستانێ قەوی زێدە مەشهوور و مەعرووفە، تەخمینا کو د تاریخا چارسەدێ هجرەتێ پەیدا بوویە و د چارسەد و حەفتێ و یەکێ دا مەرحووم بوویە، و د نیڤ حەریرێ دا مەدفوونە، وەللاهو ئەعلەم))[1].

ئەو زانینێن د ڤێ گۆتنێ دا هاتین ئەڤەنە: عەلی حەریری شاعرێ بەرێ (بەراهییێ) یێ کرمانجە، و وی دیوانچەیەک (دیوانەکا بچویک) یا شعران هەیە، و شعر و قەصیدەیێن وی د ناڤ کوردستانێ دا گەلەک د ناڤدارن، ئەو خەلکێ گوندەکییە دبێژنێ حەریر، کو سەر ب ناحییا شەمزدینان ڤەیە، ل سنجەقا

(١) ئەسکەندەر ژابا: جامعێ رسالەیان و حکایەتان، پطربۆرغ، دار الطباعتی اکادمیایی امبراطوریدا، ١٨٦٠ عیسوی ١٢٧٧ هجرتی، بپ ١٣.

هەكاری، و ل دویڤ تەخمینان ئەو ل سالا ٤٠٠ مشەختی یێ هاتییە سەر دنیایێ و ل سالا ٤٧١ مشەختی وەغەرا دووماهیێ کرییە، و قەبرێ وی ژی هەر ل حەریرێیە.

دو تێبینی ل سەر ڤێ گۆتنێ مە هەنە:

**یا ئێکێ:** مەسەلا هەبوونا گوندەکی ب ناڤێ (حەریر) کو سەر ب ناحیەیا شەمزدینان ڤە بت، ئەڤە تشتەکە ژ لایێ کەسێن زانا ب گوندێن دەڤەرا شەمزدینان نەهاتییە مسۆگەرکرن، و ل زەمانێ مە یێ ئەڤرۆ چو گوند ب ڤی ناڤی ل ڤێ دەڤەرێ نینن.

**یا دویێ:** ئەو دیرۆکا دەستنیشانکری -وەکی خودانێ ئاخفتنێ ب خۆ ژی دبێژت- یا ئاڤاکرییە ل سەر تەخمینان، و چو دەلیل ل سەر نینن، و پتریا وان دیرۆکێن ژابایی د ڤێ نامەیا خۆ دا بۆ شاعران گۆتین دبنەجهـ نینن، و ددویرن ژ ڕاستییێ.

لەو ئەم نەشێین پشتا خۆ نە ب وی جهی و نە ب وی دەمی گەرم بکەین یێن ژابایی (بەلکی ژ مەلا مەحموودێ بایەزیدی) ڤەگوهاستین.

**حەریری وەکی ژ شعرێن وی دئێتە نیاسین:**

ژابا دبێژت: حەریری دیوانچەیەکا شعران هەیە، و ئەڤە ئێک ژ دو تشتان دگەهینت: یان حەریری کێم شعر نڤیسینە و ئەو نەگەهشتینە وێ دەرجێ کو دیوانەک ژێ بێتە چێکرن، لەوا ئەو وەک دیوانچە ماینە، یان ژی ئەو شعرێن حەریری یێن گەهشتینە

زەمانێ ژابایی هند دکێم بوون کو تێرا دیوانەکێ نەکەن.. و هەر چاوا بت شعرێن حەریری یێن حەتا نوکە ژ ژێدەرێن دەستنڤیس ب دەست مە کەفتین، و مە د ڤێ کتێبێ دا بەرهەڤکرین ب تنێ دەهـ شعرن، و ب ڕاستی ئەو دکێمن.

دەمێ ئەم ل ڤان شعرێن وی دزڤڕین هندەک زانینێن گەلەک کێم ژ وی بۆ مە پەیدا دبن، ئەو ژی ئەڤەنە:

١- ئەو ب خۆ د پتر ژ جهەکی دا ناڤێ خۆ یێ دورست بۆ مە ڤەدگێڕت کو (عەلی)یە.

٢- ناسناڤێ (حەریری) ژی د پتر ژ جهەکی دا وی بۆ خۆ دانایە، مەعنا: گومان تێدا نینە کو ئەو عەلییە و حەریرییە ژی، بەلێ ئەم نزانین کانێ حەریری ناڤێ گوندێ وییە، یان ژی ناڤێ کارێ مالباتا وییە، هەر چەندە پتر هزر بۆ هندێ دچت کو ئەو ناڤێ جهی بت.

٣- عەلییێ حەریری شێخ بوو، و ژ مالباتەکا سەییدان بوو، ئەوێن نەسەبا خۆ بۆ ئیمام حوسەینێ کوڕێ عەلی -خودێ ژێ ڕازی بت- دزڤڕینن، د دانەیەکا دەستنڤیس دا ل دووماهییا شعرەکا وی هاتییە:

**مەهوەش کو وەستان صەف ب صەف**

**ئەو هاتەدەر مصری ت کەف**

**گوهتی حوسەینی لا تەخەف**

**مەقتولییا تە ب ڤێ خوەشە**

و د دانەیا دی دا هاتییە:

**مەهوەش کو وەستان صەف ب صەف**
**ئەو هاتەدەر مصری ت کەف**
**وان گۆت: عەلییۆ (لا تەخەف)**
**مە ب مردنێ ڤەوی خوەشە**

و ئەگەر ئەم ڤان هەردو دانەیان بێخینە بەرێک دێ بێژین: عەلییێ حەریری ژ لایێ نەسەبا مالباتێ ڤە خۆ وەک (حوسەینی) دنیاسی، لەو ناسناڤێ (حوسەینی) ژی وی بۆ خۆ دانایە.

٤- د دانەیەکا شعرا (خەلقۆ وەرن ببینن) دا، ل دوومـاهییێ هاتییە:

| | |
|---|---|
| **چەند بێژی عەلییێ صادق** | **ژ ئەسرار و دەقائق** |
| **ئەڤان وەصفێ ت لائق** | **ژ حوسنا یا دەلالە** |

ل دویڤ ڤێ دانەیێ دبت (صادق) ناسناڤێ عەلییێ حەریری یێ شعری بت، و دبتە ئەو وەصف ژی بت بۆ وی.. هەر چەندە دڤێت ژ بیر نەکەین کو د دانەیەکا دەستنڤیس دا ئەڤ شعرە بۆ شاعرەکێ ب ناڤێ (صادق) دئێتە پالدان، و د دەسنڤیسەکا دی دا هاتییە کو شاعرەکێ خودان دیوان ب ناڤێ (صادق عمادی) هەیە، و هێشتا ئەم ب پشتڕاستی نزانین کانێ ئەڤ شعرا ناڤێ وێ مە ئینای یا عەلییێ صادقێ حەریرییە، یان ژی یا صادقێ ئامێدییە؟!

٥- لەهجەیا عەلییێ حەریری وەکی ژ هندەک جهێن شعرا وی ئاشکەرا دبت، سەر ب لەهجەیا عەشیرەتا (سوورچییان) ڤە دچت، و ئاشکەرایە کو ئەڤ عەشیرەتە ژ وان عەشیرەتانە یێن جهێ ئاکنجیبوونا وان دکەفتە سەر توخوییێ کرمانج و سۆران، لەو ئەزمانێ وان کو د بنیات دا کرمانجییە هندەک پەیڤێن سۆرانی ژی د ناڤ دا هەنە، و مسۆگەر کارتێکرنا سۆرانییێ ل سەر لەهجەتا سوورچییان بەری پتر ژ چارسەد سالان (کو ئەو دەمە یێ حەریری لێ ژیای) گەلەک کێمتر بوویە ژ نوکە؛ چونکی دەسهەلاتا کرمانجییێ ل سەر دەڤەرێ ل وی دەمی پتر بوویە.

و ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینینە ڤە کو جهێ عەشیرەتا (سوورچییان) لێ ئاکنجی دکەفتە د ناڤبەرا (شەقلاوە) و (حەریرێ) دا و حەتا دەور و بەرێن ئاکرێ ژی، دێ ئەو هزر پتر ل بەر مە ب هێز کەفت ئەوا دبێژت: شێخ عەلییێ شاعر خەلکێ گوندێ حەریرێیە (ئەوێ نوکە مەزن بووی و هندی باژێران لێ هاتی)، و بناخەیێ وی ژ ئویجاخا سوورچییانە، و ئەو ژ مالباتا شێخ و سەییدێن وانە.

٦- ئەگەر هندەک کەس هەبن خۆ ژ هندێ حێبەتی بکەن بێژن: چاوا عەلییێ حەریری ئەوێ شعرێن خۆ ب کرمانجییەکا خوری ڤەهاندی دێ خەلکێ حەریرێ بت، و خەلکێ حەریرێ ئەڤرۆ ب سۆرانی دئاخڤن؟! دێ بێژین: عەلییێ حەریری بەری پتر ژ چارسەد سالان ژیایە، و بەری چارسەد سالان تەرازی ب وی

ڕەنگی نەبوو یێ ئـەڤـرۆ ئـەم پێ دبینین، و ژ بلـی شعـرا حـەریری هێشتا دەلـیل د دەست مە دا هەنە کو ل سەدسـالا یـازدێ مشـەختی حەتا دەور و بەرێن شەقلاوە ژی -بەلـکی وێڤـەتر ژی- ب کرمـانجی دئاخڤتن، و ئێک ژ وان دەلـیلان دەستنڤیسا کتێبا (المحاکمات)ە یا زانایێ مەزن ئەحمەدێ کوڕێ حەیدەرێ کوڕێ محەمەدێ سۆرانی، ئـەوێ دبـتـە بـاپـیرێ مـالـباتـا حـەیدەریـیـان یا ناڤدار، ڤـی زانـایی ل سالا ١٠٦٦ مشەختی (بەرانبەر ١٦٥٥ ز) دانەیەک ژ کتێبا خۆ یـا نـاڤبۆری نڤیسـییە و ل دووماهییـا وێ ئـەڤ ڕێزکـە نڤیسـینە: (تمت فی سنه ألـف ٦٦ فـی ساردآف، وەقتـێ کـوڕان دکـر بـالاڤ، نعم الـموضع للراف، وای ل ئەحمـەدێ بێگـاڤ، چەنـدیک وە ڤـەدان داڤ قەط یەک نەدیت ب چاڤ).

و ئـاشـکـەرایـە کـو بـاپـیـرێ ڤـی زانایی ئێکەمین کـەس بـوو ژ مالـباتا حەیدەرییان هاتی ل کوردستانێ ئاکنجیبووی، ل گوندەکێ نـێـزیـکـی شەقلاوە، و ئەگەر خەلـکێ شـەقلاوە و دەور و بـەرێن وێ ل وی دەمـی ب سـۆرانـی ئاخفتبانـە، ڤـی زانـایـی ئـەڤ نڤیسـینا خـۆ ب کرمانجییـەکا هنـدە زەلال نەدنڤیسـی، مـەعنا ل سەدسـالا یـازدێ مـشـەخـتـی خـەلـکـێ دەڤـەرا حـەریـرێ و حـەتا شـەقلاوە ب کرمـانجی دئاخفتن!

### عەلییێ حەریری د دەستنڤیس و کتێبێن دیرۆکی دا:

دەمـێ مـرۆڤ ل کتێبـێن دیرۆکـێ دزڤـڕت یـێن بەحسـێ ژیاننامـەیا زانایـان دکـەن ب تایبـەتی ل سەدسـالا دەهـێ و یـازدێ

مشەختی کو یا بەرهزر ئەوە شاعرێ مە لێ ژیا بت، پتر ژ (عەلی حەریری)یەکی ب بەر چاڤێن مە دکەڤن، و هەر چەندە ئەم نەشێین ب پشتڕاستی بێژین کو عەلییێ حەریری یێ شاعر ئێک ژ ڤان کەسانە بەلێ پا ئەم ب دویر نابینین ژی کو ئەو ئێک ژ وان بت، و ل ڤێرێ من دڤێت ئیشارەتێ بدەمە دو ژ ڤان زانایان.

١- شێخ عەلی یێ حەریری:

خەلکێ باژێرکێ حەریر بوو، پاشی چووبوو قەستا شامێ کربوو، و ل گوندێ (عەسسال) ئەوێ ب ڕەخ دیمەشقێ ڤە ئاکنجی بووبوو، ل وێرێ خودێ کوڕەک دابوویێ ناڤێ وی کربوو ئەحمەد، و ئەحمەد ل دەمێ خۆ ئێک ژ شێخێن ناڤدارێن طەریقا خەلوەتی بوو ل شامێ، ئەڤ شێخ ئەحمەدە ل دووماهییا سالا ١٠٤٨ مشەختی (١٦٣٩ ز) مربوو.

مەعنا: بابێ وی شێخ عەلی ژ کوڕێن سەدسالا دەهێ مشەختی بوو[1].

٢- شێخ عەلییێ حەریری یێ سوورچی:

کوڕێ محەممەد ئەفەندی یێ سوهرانی کوڕێ ئیسماعیل ئەفەندی کوڕێ عەلی ئەفەندی کوڕێ پیر ئەفەندی، د دووماهییا کتێبەکا خۆ دا ئەو هۆسا خۆ ددەتە نیاسین: ((هذا آخر ما وقع

---

(١) محمد أمين المحبى الدمشقى: خلاصة الأثر فى أعيان القرن الحادى عشر، دار صادر بيروت، ٢٤٨/١-٢٥٠.

بخاطر المفتقر إلى الله الغني المغني علي ابن محمد السورچي الحريري مولدا، العلوي نسبا)) و ژ ڤێ گۆتنێ دئێته زانین کو ئەڤ شێخ عەلییە ژ لایێ ئویجاخێ ڤە سوورچی بوو، و ژ لایێ نسەبا خۆ ڤە سەییدەکێ عەلەوی بوو (یەعنی: حوسەینی بوو)، و بوونا وی ل حەریرێ بوو.

ژ دەستنڤیسەکا دی یا ڤی شێخ عەلی دئێته زانین کو ئەو ل سالا ١٠٧٤ مشەختی (١٦٦٣ ز) ل ژیانێ بوو و ل سەردەشتێ سەیدا بوو. و ژ ڤان دەستنڤیسان دئێته زانین کو ئەڤ شێخ عەلییە زانایەکێ باش بوو، و وی هژمارەکا حاشیە و تەعلیقاتان ل سەر چەند کتێبەکان هەنە، وەکی کتێبا (شرح حكمة العين) هەر وەسا وی کتێبەک ژی ب عەرەبی د علمێ هەیئەتێ دا هەبوو[1].

ڤی شێخ عەلی کورەکێ ئەدیب و شاعر هەبوو ناڤێ وی حەمزە بوو[2]، کەشکۆلەک ل سالا ١١١٠ مشەختی (١٦٩٨ ز) ژ لایێ دو سێ کەسەکان ڤە بۆ وی هاتبوو نسخکرن، هندەک شعرێن حەمزەیی ب خۆ یێن فارسی تێدا هەنە، هەر وەسا شعرا (مەحبووبێ دەستێ خالقی) یا عەلییێ حەریری ب خۆ

---

(١) مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی بەحسێ ڤی زانایی و مالباتا وی کرییە، و ئەڤ زانینێن مە ل ڤێرێ گۆتین مە ژ کتێبا وی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد) وەرگرتینە ٣/ ٣٢٥-٣٣٠.

(٢) ل دۆر حەمزەیی و کەشکۆلا وی برێنە کتێبا (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد) وەرگرتینە ٣/ ٣٥٧-٣٧٧.

ژی تێدا هەیە، و ڤی حەمزەیی ژی کوڕەک هەبوو ناڤێ وی عەلی بوو.

و هزر گەلەک بۆ هندێ دچت کو ئەڤ عەلییێ حەریری یێ دویێ حەریری یێ شاعر بت؛ چونکی گەلەک لایێن وەکهەڤییێ د ناڤبەرا هەردویان دا هەنە، و ئەگەر هات و ئەڤ بۆچوونە ب هێشتا دەلیلان هاتە بنەجهکرن مەعنا وێ شاعرێ مە یێ حەریری دێ سوورچی بت و ژ کوڕێن سەدسالان یازدێ بت.

### عەلییێ حەریری و عەلییێ عاشق:

ماموستا محەمەد عەلی قەرەداغی د پتر ژ جهەکی دا ژ بەرهەمێ خۆ[1] ئیشارەتێ ددەتە دو شاعران ب ناڤێ عەلی، ئێک عەلییێ حەریرییە، و یێ دی عەلییێ عاشقە، و ئەو پسیارەکێ دئازرینت: ئەرێ ئەڤ هەردو شاعرە ئێکن، یان دوونە؟ و ل دەمەکی وی هزر دکر ئەو هەردو ئێکن، پاشی وەکی ئەو ب خۆ دبێژت: دەمێ من ناڤێن ڤان هەردویان د ئێک دەستنڤیسێ دا دیتی، هزرا من پتر بۆ هندێ دچت کو ئەو دو شاعرێن ژێکجودا بن.

ماموستایێ قەرەداغی د هەردو کتێبێن خۆ دا (کەشکۆلی کەلەپۆری ئەدەبی کوردیی) و (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی

---

(١) بۆ نموونە بەرێ خۆ بدە کتێبا وی (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد) ١/ ٢٧٦.

کورد) ئیشارەتێ ددەتە سێ شعرێن عەلییێ عاشق، ئێک ب فارسییە ب ڤێ مالکێ دەست پێ دکەت:

**ای عاقلان بدانند دل از جهان رهانند**
**در زیر آسمانند اینجا مقام ما نیست**

و مالکا دووماهییێ ئەڤەیە:

**اکنون علی چو مردان رو از جهان بگردان**
**این عمر نیست چندان اینجا مقام ما نیست**

و دو شعر ب کوردینە (کرمانجییەکا تێکەلی سۆرانییێ) یا ئێکێ ب ڤێ مالکێ دەست پێ دکەت:

**دیسا ل عشقا دلبەرێ سەر تا قەدەم سۆتام ب نار**
**چاو مامزێ گەردەن زەرێ ئستانت ل من صەبر و قەرار**

و شعرا دویێ ب ڤێ مالکێ دەست پێ دکەت:

**ئەلئەمان شەکوە وەکی کەم ئەز ل دەست دێم کەوکەبێ**
**مەست و مەستانە وها لێم هاتە سەر پێ غەضەبێ**

دەمێ ئەم ڤێ شعرا دووماهییێ دخوینین باش بۆ مە ئاشکەرا دبت کو ئەڤ عەلییێ عاشق (هەر چەندە بەلکی یێ سوورچی ژی بت) نە عەلییێ حەریرییە، چونکی ل جهەکی ئەو دبێژت:

**زێدەتر قاچار و ئەفشار هەردو پابەندن ز پات**
**نامویێ ئەو قەوم و خویش و موطن و مولک و وەلات**

و وەکی ئەم دبینین ئەو ناڤێ قاچاری و ئەفشارییان دئینت، و ئاشکەرایە کو ئەفشاری ل سالا ١١٤٨ مشەختی حوکمێ ئیرانێ وەرگرتبوو، و قاچاری پشتی وان هاتبوون. و ئاشکەرایە کو عەلییێ حەریری بەری هنگی ب دەمەکێ نە یێ کێم ژیابوو.

**ئەڤ کۆما شعران:**

د ڤێ کتێبا ل بەر دەست دا (١٠) شعر ژ وان یێن کو د ژێدەرێن کەڤن دا هاتین و بۆ عەلییێ حەریری هاتینە پالدان مە ڤەگوهاستینە، و (٩) ژ وان ژی مە ب ڕەنگەکێ کورت شەرحکرینە و ناڤێ بەرمایا دیوانا عەلییێ حەریری من ل سەر دانا چونکی ئەز ل وێ باوەرێمە کو ئەگەر چ حەریری کێم شعر نڤیسی بن ژی، بەلێ ئەڤە نە هەمی ئەو شعرن یێن وی ڤەهاندین، و بەلکی ل پاشەڕۆژێ و د گەل دیتنا هندەک دەستنڤیسێن دی هێشتا شعرێن حەریری بۆ مە ئاشکەرا ببن، و بەری شەرحکرنا هەر شعرەکێ مە ئەو ژێدەر دیارکرینە یێن کو مە شعر ژێ وەرگرتی، و ل ڤێرێ من دڤێت ناڤێن وان ژێدەران د گەل دیرۆکێن وان ب ڕێز بکەم:

١- کەشکۆلا موحەممەدێ کوڕێ مەسیحایی، ئەوا ل سالا ١١٨١ مشەختی ١٧٦٧ زایینی، هاتییە نڤیسین.

٢- دەسنڤیسا دیوانا شێخ ئەحمەدێ گوندشێخی، کوڕێ شێخ شەرەفێ کوڕێ شێخ ناصرێ کوڕێ شێخ عەبدللاهێ شاوری، ئەوا ل سالا ١٢٣٧ مشەختی ١٨٢٢ زایینی هاتییە نڤیسین.

٣- کەشکۆلا دیوانا مەلایێ جزیری، و مە گۆتێ کەشکۆل چونکی ژ بلی دیوانا جزیری گەلەک شعرێن جودا ژی تێدا هەنە، چو دیرۆک ل سەر نینن، بەلێ ژ ڕەنگێ کاغەزێ دئێتە زانین کو دبت ژییێ وێ نێزیکی (٢٠٠) سالان بت.

٤- دەستنڤیسا سەیید ئیبراهیمێ کوڕێ سەیید ئەحمەدێ بێسکی، کو دیوانا مەلایێ جزیری و گەلەک شعرێن دی تێدا هەنە، سال یا ئاشکەرا نینە، بەلێ ئەو بۆ سەدسالا نۆزدێ دزڤرت.

٥- دەستنڤیسا دیوانا جزیری، یا مەلا مصطەفایێ کوڕێ مەلا ڕەشیدێ یووسفی، ل سالا ١٣٥٧ مشەختی، ١٩٣٨ زایینی نڤیسی.

٦- دەستنڤیسا مەلا عەلییێ کوڕێ ڕەسوولێ سووسنی (سووسنێ گوندەکێ زێبارییانە، دکەفتە دەڤەرا ئاکرێ) ل سالا ١١٦٠ مشەختی ١٧٤٧ زایینی نڤیسی.

٧- دەستنڤیسا بۆ مەولانا حەمزەیێ کوڕێ عەلی ل سالا ١١١٠ مشەختی ١٦٩٨ زایینی هاتییە نڤیسین.

و ئەڤ هەردو دەستنڤیسێن دووماهییێ د دەست مە دا نینن، بەلێ مامۆستا محەممەد عەلی قەرەداغی شعر ژ وان وەرگرتینە، و مە ژی ژ کتێبا وی وەرگرتییە، و ل جهێ وی وێنەیێن وان دەستنڤیسان بەلاڤکرین مە شعر ئێکسەر ژ دەستنڤیسێ وەرگرتییە.

و ژ بلی ژێدەرێن دەستنڤیس مە مفایەکێ زێدە ژ کتێبا (هۆزانڤانێت کورد) یا سەیدایێ صادق بهائەددین ئامێدی،

وەرگرتییە، و مفایەکێ زێدەتر ژ کتێبا (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد لە ڕێگەی دەستخەتەکانیانەوە) یا مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی.

هیڤییا من ئەوە ئەز شیابم خزمەتەکا بچویک پێشکێشی دیوانا عەلییێ حەریری بکەم، و خودێ هاریکارێ مە هەمییان بت.

تەحسین دۆسکی
دهۆک ١٤٣٩
٢٠١٨ ز

## شعرا ئێکێ

مەحبووبێ دەستێ خالقی
سولطان موحەممەد موصطەفا
مەعشووقێ عشقێ عاشقی
سولطان موحەممەد موصطەفا

عاشق ل دینێ ئەکبەری
میری و هەم پێغەمبەری
نازک سوارێ مەحشەری
سولطان موحەممەد موصطەفا

ڕۆژا حسێب و وەحشەتێ
قەد کە ژ کەسێ چاف هلنەتێ
بستە د حینا روخصەتێ
سولطان موحەممەد موصطەفا

بستە ژ حەق داخواز دکا
(أز عشق او پرواز) دکا
گەه گەه نیاز گەه ناز دکا
سولطان موحەممەد موصطەفا

نازدارێ حەبیبێ قادرە
تەحقیق نەبیبێ ئاخرە
گوێێ کەمالاتێ برە
سولطان موحەممەد موصطەفا

حەددێ کەمالێ قەنج پەدید
ضددێ بەطالێ قەنج پەدید
حوبێ وصالێ قەنج پەدید
سولطان موحەممەد موصطەفا

زانیت خوە نووحی لێ چ هات
لەو بوو ل طووفانێ نەجات
دائم ل دل قەت دەر نەهات
سولطان موحەممەد موصطەفا

نارێ خەلیلێ کردگار
لەو لێ بوو مێرگ و میرغەزار
دائم ل دل گرتبوو قەرار
سولطان موحەممەد موصطەفا

یووسف بران ئاڤێتە بیر
لەو بردە مصرێ کردە میر
هەر بوو د لیسان و ضەمیر
سولطان موحەممەد موصطەفا

یـوونس کـو ماسـیێ خـوار و چـوو
لـــەو هاتـــە دەر ســـالم گـــەلۆ
دائـــم د دل ئـــەو چ دگـــۆ
ســولطان موحەممـــەد موصـــطەفا

خـــەلقۆ یەقینـــە ئـــەو خەبـــەر
بـــەحرا مووســا لـــەو بـــوو ب کـــەر
دائـــم ل دل قـــەط ناتـــەدەر
ســولطان موحەممـــەد موصـــطەفا

دلپاشـــێ حـــەق ئـــەو کافییـــە
دەرمـــانێ دەردی شـــافییە
جوملـــە ب نـــوورێ صـــافییە
ســولطان موحەممـــەد موصـــطەفا

نـــوورێ د ئـــەرض ئەفلاکـــە تـــەن
دوررێ فـــی ئـــەو لەولاکـــە تـــەن
نـــەبیێ ژ ئەصـــلێ پاکـــە تـــەن
ســولطان موحەممـــەد موصـــطەفا

بیـــی وەفـــا کـــردی نەســـەق
ویـــری ژ هـــەم دەرســـان ســـەبەق
هـــەر چ کەســـێ ناســـی ب حـــەق
ســولطان موحەممـــەد موضـــطەفا

هــــەر چ کەســـێ یـــارێ وییـــە
ئـــو دل دە دلـــــدارێ وییـــــە
یـــا وەک تکـــــادارێ وییـــــە
ســــولطان موحەمـــەد موصـــطەفا

یـــا وەک یـــەقین فرئاشـــێ تـــو
خـوەش یـار و خـوەش ئۆلداشـێ تـو
روحـــێ عـــەلی شاباشـــێ تـــو
ســــولطان موحەمـــەد موصـــطەفا

## مەحبووبێ دەستێ خالقی

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (رەجەزا هەشتەیی) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییە: (مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ)، ئەڤ شعرە مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی د کتێبا خۆ دا (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد)[1] ئینایە، و وی ئەو ژ دەستنڤیسەکا کەڤن وەرگرتییە کو ل سالا ١١١٠ مشەختی (بەرانبەر ١٦٩٨ ز) بۆ (حەمزەیێ کورێ مەولانا عەلی) هاتییە نڤیسین، و مامۆستا قەرەداغی بەرپەرکێ دەستنڤیس ژی د گەل بەلاڤکرییە، ئەم ل وی بەرپەری زڤرینە و شعر مە ئێکسەر ژێ وەرگرتییە، بەلێ مخابن ب تنێ نەهـ مالک د وی بەرپەری دا هەنە، و ئەوا مایی ژ شعرێ مە بنیاتێ وێ نەدیتییە، لەو ل هندەک جهان کێماسی تێدا هەنە، و هندی ئەم هاتینێ مە چو سەر ژێ نەبرنە دەر!

مژارا سەرەکی یا ڤێ شعرێ وەکی ژ دووماهییا هەمی مالکان ئاشکەرا دبت د مەدحا پێغەمبەری دایە -سلاڤ لێ بن- و ئەو تایبەتمەندییێن خودێ ژ کەرەما خۆ داینە وی.

---

(١) د بەرگێ سێییێ دا، بەرپەرێن (٣٦٠-٣٦١)، چاپا ١، سالا ٢٠٠٠ ز، بەغداد.

شاعری ب ڤێ شعرا خۆ دڤێت ڤیانا خۆ یا زێده بۆ پێغەمبەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- ئاشکەرا بکەت، و دبێژت:

**مەحبووبێ دەستێ خالقی**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**
**مەعشووقێ عشقێ عاشقی**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**

ئەی سولطان و سەروەرێ مە موحەممەد موصطەفا، تو ئەو مەحبووبی یێ ب دەستی خالقی هاتییە ئافراندن، و تو ئەو مەحبووبی یێ هەر عاشقەک عشقا خۆ بۆ تە پێشکێش دکەت.

**عاشق ل دینێ ئەکبەری**
**میری و هەم پێغەمبەری**
**نازک سوارێ مەحشەری**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**

ئەی موحەممەد موصطەفا، کانێ چاوا تو ئەو مەعشووقی یێ عشق بۆ تە دئێتە پێشکێشکرن، وەسا تو ئەو عاشقێ مەزنتری ژی ل دینی، و تو میر و خودان دەسهەلاتی و پێغەمبەری ژی، ل ڕۆژا مەحشەرێ یا کو خەلک هەمی تێدا دکەڤنە تەنگاڤییێ تو ئەو سویاری یێ ب نازکی و سڤکی بۆ پێشڤە دچی، و داخوازێ ژ خودایێ خۆ دکەی کو ئەو بێت و حسێبێ د گەل خەلکی بکەت.

**رۆژا حســـــێب و وەحشبـــــەتێ**
**قــەد کــە ژ کەســێ چــاڤ هلنــەتێ**
**بســـــتە د حینــــا روخصـــــەتێ**
**ســـولطان موحەممـــەد موصــطـەفا**

ل رۆژا مەحشـەرێ یـا ب تـرس و تـژی هەیبـەت و وەحشـەت، دەمـێ خـەلـک هەمی تێدا بۆ حسێبێ دئێنه کـۆمکرن، ل وی دەمـێ ژ ترسان دا قەت چاڤێن کەسێ ل کەسێ ڕانـەبن و هلنـەئێن، پشـتی روخصەت ژ لایێ خودایێ تە ڤە بۆ تـە دئێتـە دان کـو تـو مـەهـدەرێ بکەی، تو ب بستەیی و بێ ترس پێشڤە دچی و مەهدەرێ دکەی.

**بســـــتە ژ حـــەق داخــــواز دکــــا**
**(أز عشـــــق او پـــــرواز) دکــــا**
**گـەهــ گـەهــ نیـاز گـەهــ نـاز دکـا**
**ســـولطان موحەممـــەد موصــطـەفا**

ل وی دەمـی تـو -ئـەی موحەممـەد موصـطـەفا- بسـتە و بـێ ترس ب نک خودایێ خۆ یێ حەق ڤە دچی و داخوازێ ژێ دکەی کو ئـەو بێـت و حسێبێ د گـەل خـەلکێ مەحشـەرێ بکـەت، و ژ بـەر بـهـایـێ تـە یـێ مـەزن ل نـک وی ئـەو داخـوازا تـە ب جهـ دئینـت و د بـەرسڤا تە دئێت، و ژ بەر ڤیانا تە یا مـەزن بـۆ خۆشـتڤی تـو ب لەز ب نک وی ڤە دچی دێ بێژی تـە دڤێـت ب نـک ڤـە بفـڕی، گاڤـەکێ تـو هیڤـی و رجـایێ ژێ دکـەی، و گاڤـەکێ تـو ب نـازکی داخوازێ ژێ دکەی، و ئەو داخوازا تە ب جهـ دئینت.

نـــــازداریَ حــــــەیییَ قـــــادره
تـــــەحقیق نـــــەبیینَ ئـــــاخره
گـــــۆیێ کـــــەمالاتێ بـــــره
ســـولطـان موحەمـمـــەد موصـــطـەفا

سولطـان موحەمـمـەد موصـطـەفا -سلاڤ لـێ بن- نـازداریێ خودایێ هەردەم زێندی و خودان شیانە، و مسۆگەر ئەو پێغەمبەرێ دووماهیییێیە یێ خودێ بۆ مرۆڤان هنارتی، لەو وی گۆیا هەمی کەمالاتان ب نک خۆ ڤە برییە، یەعنی: هەمی صیفاتێن کەمالێ ل نک وی هەنە.

حـــەددێ کـــەمالێ قـــەنج پەدیـــد
ضـــددێ بـــەطالێ قـــەنج پەدیـــد
حـــوبێ وصـــالێ قـــەنج پەدیـــد
ســـولطـان موحەمـمـــەد موصـــطـەفا

توخوبێ کەمالێ یێ د شیان دایە مرۆڤ بگەهنێ ل نک وی قـەنج یێ پەیدا و ئاشکەرایە، و دژی بەطالییێ کو حەقییە، وی قەنج ل نک خۆ پەیدا کرییە، ڤیانا ویصال و گەهشتنا ئارمانجێ ژی وی قەنج ل نک خۆ پەیدا کرییە. مەعنا: ئەو ژ هەر لایەکی ڤە یێ تمامە.

زانیـــت خـــوە نـــووحی لـــێ چ هـــات
لـــەو بـــوو ل طـووفـــانێ نـــەجات
دائـــم ل دل قـــەت دەر نـــەهات
ســـولطـان موحەمـمـــەد موصـــطـەفا

د ڤێ مالکێ و چەند مالکێن بێن دا شاعر موبالەغەیەکا ئاشکەرا دکەت، و د دەتە زانینێ کو ژ بەر بەرەکەتا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- و چونکی بەحسێ وی ل سەر دل و ئەزمانێ پێغەمبەرێن بەری وی بوو، خودێ ئەو ژ تەنگاڤییا ڕزگارکرن، دبێژت: ژ خۆ دئێتە زانین کانێ چ ب سەرێ نووح پێغەمبەری هاتبوو، دەمێ وی نفرین ل مللەتێ خۆ یێ کافر کری ڤێجا خودێ ئاڤ ل وان ڕاکری و تووفان ب سەر دا ئینای، هنگی نووح ژ تووفانێ ڕزگاربوو، بۆچی؟ چونکی ڤیان و بەحسێ موحەممەد موصطەفایی -سلاڤ لێ بن- ژ سەر دلێ وی نەدچوو، و ئەو ژ دلێ وی نەدهاتەدەر!

و ب ڕاستی ڤێ چەندێ چو دەلیلێن دورست ژ کیتاب و سوننەتێ ل سەر نینن، و تشتێ ب ڤی ڕەنگی بت بێ دەلیل نائێتە زانین.

نارێ خەلیلێ کردگار<br>
لەو لێ بوو مێرگ و میرغەزار<br>
دائم ل دل گرتبوو قەرار<br>
سولطان موحەممەد موصطەفا

(میرغەزار) ب ڤی ڕەنگی د بنیات دا هاتییە، و مەعنایا وێ ل بەر من یا ئاشکەرا نینە، هەر چەندە ژ سیاقێ ئاخفتنێ ئاشکەرا دبت کو دڤێت ئەو ب مەعنایا باغ و بەحەشتێ یان خۆشی و تەناهییێ بت. دبێژت: ئاگرێ خۆشتڤییێ خودێ کو

ئیبراهیمه -سلاڤ لێ بن- لەوا ل سەر وی بوو مێرگ و چیمەن، و خۆشی و تەناهی؛ چونکی بەحس و ڤیانا موحەممەد موصطەفایی -سلاڤ لێ بن- جهێ خۆ هەردەم د دلێ وی دا گرتبوو.

**یووسف بران ئاڤێته بیر**
**لەو بردە مصرێ کردە میر**
**هەر بوو د لیسان و ضەمیر**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**

یووسف پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- دەمێ برایێن وی ئەو بری و هاڤێتییە د بیرێ دا، لەو خودێ د هەوارا وی هات و ئێکا وەسا کر ئەو ژ وێ بیرێ بێتە دەرێخستن و بۆ مصرێ بێتەبرن، و ل وێرێ ببتە میر؛ چونکی هەردەم ناڤێ سولطان موحەممەد موصطەفایی ل سەر ئەزمان و دلێ وی بوو.

**یوونس کو ماسیێ خوار و چوو**
**لەو هاتە دەر سالم گەلۆ**
**دائم د دل ئەو چ دگۆ**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**

ئەی گەلۆ! یوونس پێغەمبەری ژی -سلاڤ لێ بن- دەمێ هاتییە هاڤێتن د دەریایێ دا، و نەهەنگی ئەو خواری و چووی، لەوا ئەو ب سلامەتی ژ زکێ وی نەهەنگی دەرکەفت، و زڤری هشکاتییێ؛ چونکی هەردەم ڤیانا سولطان موحەممەد موصطەفایی د دلێ وی دا بوو.

و دەمێ خودایێ مەزن بەحسێ یوونسی د قورئانێ دا دکەت، و ئەگەرا دەرکەفتنا وی ب سلامەتی ژ زکێ نەهنگی ئاشکەرا دکەت، دبێژت: ﴿ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ۝ لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ۝ ﴾ (الصافات: ١٤٣-١٤٤) یەعنی: ئەگەر ژ بەر وی عیبادەتی و کارێ چاک نەبا یێ وی بەری بکەفتە د زکێ نەهنگی دا کری، و کو وی دەمێ د زکێ نەهنگی دا تەسبیحا خودێ دکر و دگۆت: **(لا إلـه إلا أنـت سبحانک إنـي كنت مـن الظالمين)**، ئەو هەر دا د زکێ نەهنگی دا مینت، و ئەو دا بتە گۆڕا وی حەتا ڕۆژا قیامەتێ. و ئەو ئەگەرا شاعر د ڤێ مالکی دا بۆ دەرکەفتنا وی دبێژت چو دەلیلێن دورست ل سەر نینن.

**خەلقێ یەقینە ئەو خەبەر**
**بەحرا مووسا لەو بوو ب کەر**
**دائم ل دل قەط ناتەدەر**
**سولطان موحەممەد موصطەفا**

گەلی مرۆڤان! ئەو خەبەرەکێ ڕاست و دورستە و چو گومان تێدا نینە، ئەوێ دبێژت: لەو دەریا ل بەر سنگێ مووسا پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن- ڤەبوو و هاتە کەلاشتن، و ئەو و هەڤالێن وی ژێ دەرباس بوون؛ چونکی هەردەم ڤیانا موحەممەدی -سلاڤ لێ بن- ژ دلێ وی نەدهاتەدەر.

و ڤـی خەبـەری ژی، وەکـی یـێ دەرکـەفتنا یوونسـی ژ زکـێ نەهنگی، چو دەلیل ژ کیتابێ و سوننەتێ ل سەر نینن، هـەر چەنـدە شاعر دبێژت: ئەڤە خەبەرەکێ یەقینییە ژی!

**دلپاشـــێ حـــەق ئـــەو کافییـــە**

**دەرمـــــــانێ دەردی شـــــــافییە**

**جوملـــــە ب نـــــوورێ صـــــافییە**

**ســـولطان موحەممـــەد موصـــطەفا**

ژ ڤێـرێ وێڤـە دەستنڤیس د دەسـت مـە دا نینـە، و مـە ئـەو نـەدیتییە، و ل پتر ژ جهەکی کێماسـی د ڕاکرنـا شـعـرێ دا هەنـە، و ل دویڤ ئجتهادا خۆ مە ئەو ڕاست و شرۆڤە کرییە، پەیڤا ئێکـێ ژ ڤێ مالکێ د بنیات دا ب ڤی ڕەنگییە: (دلپاشـی)، و ب هزرا من ئەو دورست نەهاتییە ڕاکرن؛ ژ بەر کو مەعنایا وێ یا ئاشـکەرا نینە.

و هەر چاوا بت شاعر د ڤـێ مالکێ دا مـەدحێن پێغەمبـەرێ خودێ -سلاڤ لێ بن- دکەت و ددەتە زانین کـو وی دلـەکێ بـاش و ساخلەم د دەر حـەق ڕاسـتی و حـەقییێ دا هـەبوو، ئەڤـە ئەگـەر ئـەم بخوینین: (دلباشێ حەق)، و ئـەو بەسـە و کافییـە کـو مــرۆڤ خـۆ ب ڤیـانــا وی ڤــە گرێـدەت و ل ســەر ڕێبــازا وی بچــت، و ئــەوە دەرمان و شفا بۆ هەر دەردەکێ هـەبت، و ئـەو تێـکدا ژ ڕۆناهییـەکا صافی چێبوویە، کو ڕۆناهییا حەقە.

نـــووریٚ د ئـــەرض ئەفلاکـــە تـــەن
دورریٚ فـــی ئـــەو لەولاکـــە تـــەن
نـــەبیێ ژ ئەصـــلیٚ پاکـــە تـــەن
ســـولطان موحەممـــەد موصـــطەفا

د بنیات دا (نو ارض افلاکتن) هاتییە، بەلێ چونکی د دووماهییا مالکا بۆری دا شاعر دبێژت: (نووریٚ صافییە) ب هزرا من پەیڤا ئێکێ ژ ڤێ مالکێ دیٚ (نوور) بت، و ئەڤ تەرزە گەلەک جاران د شعرا کلاسیکی دا دئێتە دیتن، و (تەن) ئەوا د قافییا هەر سێ رێزکێن ئێکێ دا هاتییە پەیڤەکا فارسییە رامانا (لەش)ی ددەت، و مەخسەد پێ پێغەمبەرە -سلاڤ لێ بن- دبێژت: ئەو رۆناهییا د عەرد و عەسمانی دا هەی ژ پێغەمبەرییە، و رێزکا دویێ د بنیات دا ب ڤی رەنگییە: (در فی او لولاکتن)، و (لەولاکە) ئیشارەتە بۆ ویٚ گۆتنا بێ بناخە ئەوا وەک حەدیس دئێتە ڤەگێران: (لولاک لما خلقت الأفلاک) یەعنی: ئەگەر ژ بەر تە نەبا من دنیا نەدئافراند. و دبێژن: ئەڤە گۆتنا خودێیە بۆ پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، بەلێ ئەڤ گۆتنە -وەکی زانایێن حەدیسێ دبێژن- حەدیسەکا (مەوضووع) و بێ بناخەیە.

بەلکی مەخسەدا شاعری ژ ڤێ رێزکێ ئەو بت: تویی ئەو دوررا د (لەولاکە) دا هەی، یەعنی: تویی مەخسەد ب ڤێ گۆتنێ، و ئەگەر ژ بەر تە نەبا گەردوون هەمی نەدهاتە ئافراندن، و تویی

-ئەی موحەممەد موصطەفا- ئەو پێغەمبەرێ ژ هێڤێنەکێ پاک و بژوین هاتییە دورستکرن.

**بیـــی وەفـــا کـــردی نەســـەق**
**ویـــری ژ هـــەم دەرســـان ســـەبەق**
**هـــەر چ کەســـێ ناســـی ب حـــەق**
**ســـولطان موحەممـــەد موصـــطەفا**

نیڤا ئێکێ ژ ڤێ مالکێ ل بەر من یا ئاشکەرا نینە، وەسا نەبت ئەم بخوینین: (بیی وەفا گەر دێ نەسەق، گرتی ژ هەم دەرسان سەبەق) و هنگی بەلکی مەعنایا مالکێ تێکدا ب ڤی رەنگی لێ بێت: ئەی سولطان موحەممەد موصطەفا! هەر کەسەکێ تە ب راستی و دورستی بناست، و کار و بارێ خۆ ب وەفاداری رێک بێخت، دێ دەرسان بۆ خۆ ژ ڤان سەبەقان وەرگرت.

و سەبەق بۆ مالکێن شعرێ دئێتە گۆتن.

**هـــەر چ کەســـێ یـــارێ وییـــە**
**ئـــو دل دە دلـــدارێ وییـــە**
**یـــا وەک تکـــادارێ وییـــە**
**ســـولطان موحەممـــەد موصـــطەفا**

هەر کەسەکێ ب راستی و دورستی ببنە یار و خۆشتڤییێ وی، یەعنی: پێغەمبەری -سلاڤ لێ بن-، و ژ دل دلدار و ئەڤینداری وی بت، ئەو دێ هیڤیداری وی بت.

د بنیات دا (باوک تکادار) هاتییه.

**یــــا وەک یـــەقین فرئاشـــێ تـــو**
**خـوەش یـار و خـوەش ئۆلداشـێ تـو**
**روحـــێ عـــەلی شاباشـــێ تـــو**
**ســـولطان موحەممـــەد موصـــطەفا**

نیڤـا ئێکـێ ژ ڤـێ مـالکێ د بنیـات دا ب ڤـی ڕەنگییـه: (بـاوک یـاقین فـرآش تـو) و مـەعنایا وێ ل بـەر مـن یـا ئاشـکەرا نینـه.. و گـۆتن ل ڤێـرێ بـۆ پێغەمبەرییـه -سلاڤ لـێ بـن- شـاعر دبێـژت: ئـەی پێغەمبـەر تـو خـۆش یـار و خـۆش هـەڤڕێیی، روحـا عەلی، کو ناڤێ شاعرییه، بۆ ته ببته خەلات و قوربان.

## شعرا دویێ

دلێ مەحزوون کفارەت بیت
کە ئیمشەب تازە مهمان تێت
ب مزگینی بشارەت بیت
کە مهمان جانێ جانان تێت

کە مهمان جانێ جانانە
ل سەر چەشمێ مە مهمانە
ب مالا جوملەئێ خانە
کە شاهێ جوملەئێ خان تێت

وەرە ئەی شاهدێ شێرین
ژ عشقا تە دل ئێخسیرین
ب جان مەنزلگەهێ میرین
طەلەبکارین کە سولطان تێت

طەلەبکارین دلارایم
مودیم یارین ب وی شاییم
ل بەژنا عەرعەرین دایم
سیەهمار لێ ب جەولان تێت

سـيـەهماران كـره سـەيران
كـو خـاص و عـام ببوون حـەيران
ل جـۆتێ شـوبهەتی جـەيران
ل جـەيران عەنبـەر ئەفشـان تێـت

دو زولفێـت عەنبـەر ئەفشـانن
دو لـەعلێت شەككرسـتانن
عـەقيق و دورِ و مـەرجانن
ل حەوضـان ئـابێ حـەيوان تێـت

عـەجيب بوركـە مـراری تـێ
ل سـەددێ قەوسـێ تـاری تـێ
سيەهـ پـەنجێن خومـاری تـێ
ژ مـەخمووران دو ئەصلان تێـت

ژ مـەخمووران تـو مـەخمووری
ب جـی هێشـت عـەقرەبا ژۆری
طـەوافا بـەيتێ مـەعمووری
ل بورجان خوون ب سەيران تێـت

عەقارب هات و بێ حەد هات
ل وێ بورجـا زەبەرجـەد هـات
ڤ بـالا قەوسـێ ئەسـوەد هـات
ل طەلبـەی مـاهێ تابـان تێـت

ل هـــەيڤا كەوچـــەرين كامـــل
ڤ ئـــەهلان ڕا نەهێشـــتن دل
وە جوملـــە دا صـــەفێن سـونبول
ل هنـــداڤى گولســـتان تێـــت

گولســـــتانا خـــودا ڕِســـــتە
ل چـار ئـەطراف دلان خوەســتە
بنـــەفش و نێرگـــزا مەســـــتە
جنسـرى لـەعل و ڕەيحـان تێـت

ڕەيـــاحين سووســــــن و وەردن
وە ڕەســـتێ ئەحمـــەر و زەردن
ل شێخ عـەليێ غـەريب فـەردن
هـەڕۆ سـەد جار د ئـەفغان تێـت

ژ ئـــەفغانان نـــەمايم تێـــر
ببينـــە شـــەڕ دوا صـــولح دێـــر
دوعـــاگۆيێ تـــو ئـــەز بێڤێـــر
حـەتا ڤ قاصـدێ جـان تێـت

ببينــــــــە ڕووشــــــەمالينى
وەرە هنـــــــداڤى بـــــــالينى
ژ دەســـت ئاهـــان و نـــالينى
چ ڕەنگ فرياد ژ عـەسمان تێت

ب فریـــــاد و ب هـــــاواره
ژ دەست ئاهـان مـن ئـەو کـاره
مـــولازم بـــەنـــدەئێ ژاره
ژ ســـەییدی چ فـــەرمان تێـــت
ســـەیدیێ حـەق نەظـــەر ڤێـــرا
ت ئقلیمـــان عەلـــەم گێـــرا
قطـــارا گەوهـــەران ڤێـــرا
ژ نێـڤ کانـا بدەخشـان تێـت
بدەخشـــانان کـــو گەوهـــەر دا
ب قنطـــار نـــەختیان زەر دا
دەلالـــەت دەینـــێ ئەکبـــەر دا
ژ ئقلیمـــێ هندســـتان تێـــت
خـــەراج کـــر کشـــوەرێ هنـــدی
ل کشـــمیر چاڤڕەشـــێ جنـــدی
ل مـــەحبووبا ســـەمەرقەندی
هەزار ڕەنگ توحفە ئحسان تێت
هـــەزار ڕەنـــگ توحفـــەئێ نـــادر
هـــەر ســـال ژ نـــوو بکـــن حاضـــر
... ... ... ...
ژ تـــەبریز و خەراســـان تێـــت

خەراجێ ئەصفەهان دیسە
ژ خواجان خالی مان کیسە
ژ بۆ شۆخا کو بەلقیسە
قوماشێ کەز ب تۆمان تێت

قوماشێ کەز ب سەد زێڕی
ت بەر بەژنا پەری چەهری
خەبەر چوو حاکمێ ژێری
ل ڕی و بار ب سەیران تێت

دەور وی هات حەریر قۆمە
ژ زیڤ و زێڕ کرە کۆمە
خەبەر چوو حاکمێ ڕۆمە
ب کەشتێ خەرجیان وان تێت

ئەمر وێ هات ژ خوندکاری
ل ڕۆمێ حوکمی کر جاری
خەراجا زەنگیان باری
ل مصرێ و حەتا وان تێت

ل حەلەب شووشەئێ دەند تێت
ت گەل ئابا فەرەحمەند تێت
... ... ... ...
ل بۆ شاهێ د شاهان تێت

تـــو شـــاهێ جوملـــەئێ شـــاهی
ب حـــەققێ ئیســـمێ ئـــەللاهی
نـــەکی مـــەنعم ل دەرگـــاهی

کو ئەو مەجنوونێ ئاسان تێت

حـــەریری کـــەر چ حەیرانـــە
ل مـــەدحێ تـــە شـــەش ئەزمانـــە
دوعـــاگۆ و ســـەناخوانە

حەتا ڤ قاصدێ جـان تێـت

## دلێ مەحزوون كفارەت بیت

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (هەزەجا هەشتەیی) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی ڕەنگییە: (مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ)، و مە ئەو ژ دو ژێدەران وەرگرتییە: دەستنڤیسا محەمەدێ كوڕێ مەسیحایی، و كەشكۆلا دیوانا مەلایێ جزیری.

مژارا سەرەكی یا شعرێ ل دۆر عشقا مەزنا شاعری بۆ خۆشتڤییێ وی یێ بێ هەڤكویف دزڤڕت، و هەر ژ سەری ئەو ددەتە زانین كو هەر جارەكا مزگینییا هاتنا خۆشتڤی بگەهتە وی، ئەو دێ دلێ خۆ یێ خەمگین ژ بەر دەردێ عشقێ وەك كفارەت و بشارەت ددەت.. پاشی ئەو د پترییا شعرا خۆ دا ئاشكەرا دكەت كو خۆشتڤییێ وی ئەوە یێ ژ بەر دەسهەلاتا وی یا زێدە ل سەر هەمی مەحبووبان خەرج و خەراج ژ هەمی وەلاتان بۆ دئێت، ژ وەلاتێ ئیرانێ بگرە و حەتا رۆمێ، ژ مصرێ و حەتا وان و هندستانێ..

**دلێ مەحزوون كفارەت بیت**
**كە ئیمشەب تازە مهمان تێت**
**ب مزگینی بشارەت بیت**
**كە مهمان جانێ جانان تێت**

د شریعەتێ ئیسلامێ دا هندەک گونەهـ هەنە هەر کەسەکێ وان بکەت دڤێت کارەکێ باش بکەت یان خێرەکێ بدەت دا ئەو گونەها وی پێ بێتە ژێبرن، و لێ نەئێتە گرتن، و دبێژنە وی کاری یان وێ خێرێ: کفارەت زاراڤەکێ شەرعییە بۆ وی کاری دئێتە گۆتن یێ خودان دکەت دا گونەهەکا وی پێ بێتە ژێبرن، و (ئیمشەب) پەیڤەکا فارسییە مەعنایا ئەڤ شەڤە ددەت، و د بنیات دا (ئیمشەت) هاتییە، بەلێ ب هزرا من ئەو خەلەتییە چونکی چو مەعنا بۆ نینن، و (بشارەت) پەیڤەکا عەرەبییە ڕامانا مزگینییێ ددەت، بەلێ مەخسەت پێ ل ڤێرێ ئەو خەلاتە یێ بۆ وی کەسی دئێتەدان یێ مزگینییەکێ دگەهینتە مرۆڤی.

شاعر دبێژت: ئەڤ شەڤە ئەز دلێ خۆ یێ خەمگین دێ کفارەت دەم، کو تازە مێهڤانێ مە بێت، و سەرەدانا مە بکەت، و هەر وی دلێ خۆ ئەز دێ کەمە خەلات بۆ مزگینییا هندێ کو ئەو مێهڤانێ تێت خۆشتڤییێ مە بت یێ رحا رحان!

**کە مهمان جانێ جانانە**
**ل سەر چەشمێ مە مهمانە**
**ب مالا جوملەئێ خانە**
**کە شاهێ جوملەئێ خان تێت**

کو مێهڤانێ مە یێ ئەڤ شەڤە جانێ جانانە، ل مە دئێتە کەرەمێ و سەرەدانا مە دکەت، ئەو ل سەر چاڤێ مە مێهڤانە، یەعنی: دەمێ ئەو دئێت هندی هند ئەو یێ ب قەدر و بهایە ل بەر

مه، جهێ وی دێ دانینه سەر چاڤێن خۆ، و دەمێ شاهێ هەمی خانان، کو خۆشتڤییێ مەیە، دئێت و ل مه دبته مێهڤان، ئەو ل مالا مه، و ب مه و ل بەر دلێ مه ب هەمی خان و سولطانانه، یەعنی: دەمێ ئەو دئێته نک مه ب مێهڤانی هەر وەکی خان و سولطانێن دنیایێ هەمی هاتینه نک مه؛ چونکی شاهێ وان هەمییانه.

**وەره ئەی شاهدێ شێرین**
**ژ عشقا ته دل ئێخسیرین**
**ب جان مەنزلگەهێ میرین**
**طەلەبکارین که سولطان تێت**

(شاهد) د زمانێ عەرەبان دا بۆ وی کەسی دئێته گۆتن یێ هەردەم ل نک مرۆڤ ئامادە، و چو جاران ژ بەر چاڤان نەچت، و گەلەک جاران ل نک شاعرێن کلاسیک ئەو بۆ خۆشتڤی دئێته گۆتن؛ ژ بەر کو چو جاران ئەو ژ بەر دلێ حەژێکەرێ خۆ وندا نابت.

شێخ عەلییێ حەریری دبێژت: ئەی خۆشتڤییێ مه یێ شرین، ڤێجا کەرەم کە وەره نک مه ب مێهڤانی؛ چونکی دلێ مه ئێخسیرێ عشقا تەیە، تو میرێ مەیی و ئەگەر تو هاتییە نک مه جهێ تە دێ رحا مه بت، ژ بەر کو ئەم ب جانێ خۆ جهـ و مەنزلگەهین بۆ میری، و هەردەم ئەم رجاکار و دوعاخوازین کو سولطانێ مه بێت و سەرەدانا مه بکەت.

طەلـــــەبكارين دلارايـــــيم
مـــوديم يـــارين ب وى شـــاييم
ل بـــەژنا عەرعـــەرين دايـــيم
سـيەهمار لـێ ب جـەولان تێـت

(دلارام) ب فارسى بۆ وى تشـتێ جوان و تـازە دئێتـە گۆتن يێ دلـێ مرۆڤـى پـێ تـەنـا و رحـەت دبـت، و گەلـەک جـاران ئـەو وەک كينايەت بۆ خۆشتڤى دئێتە ب كارئينان، و (موديم) مودامـە، يـەعنى: بـەردەوام و هـەرگاڤ، شـاعر دبێـژت: ئـەم رجاكـار و داخوازكەرێن بەردەوامين بۆ وى خۆشتڤييێ يێ دلێ مـە پـێ رحەت و تـەنا دبـت، و ئـەم هـەردەم يـارێن وينـە و ب وى دلشـاد و كەيفخۆش دبين، ئـەو خۆشـتڤى يـێ بـەردەوام ب سـەر بـەژنا وى يـا وەكى دارا هەڤرستێ (عەرعەرێ) يا ڕاست و زراڤ كـەزييێن وەكـى ڕەشماران شۆڕ دبن و دئێتە خوار ژ دهژييێن.

ســـيەهماران كـــرە ســـەيران
كـو خاص و عـام ببوون حەيران
ل جـــۆتێ شـــوبهەتى جـــەيران
ل جـەيران عەنبـەر ئەفشـان تێـت

ئـەگـەر ئـەم حـەرفا جيمـێ ژ پـەيڤا (جـەيـران) ب فـەتحێ بخوينين -وەكى كو د دەستنڤيسـێ دا هاتى- ئـەو دێ بتـە پەيڤـەكا تركى، و دێ ڕامـانـا مـامــز و خـەزالـێ دەت، و ئەگەر ئـەم وێ ب كسـرێ بخـوينن دێ بتـە پەيڤـەكا عـەرەبى و ڕامانـا هەڤسـوى

دەت، و (جۆت) وەکی ژ مالکا بێت ژی ئاشکەرا دبت مەخسەد پێ هەردو بسکن، و (ئەفشان) ب فارسی مەعنایا بەلاڤکرنێ ددەت.

شاعر دبێژت: کەزیێن وەکی ڕەشماران ب سەر بەژنێ دا هاتنە خوارێ، دێ بێژی یێ سەیرانێ دکەن، ب ڕەنگەکێ وەسا کو مرۆڤێن خاص و عام لێ بوونە حەیران، و سەودا ژ سەری چوو. ئەو کەزیێن وەکی ڕەشماران کەفتنە ب ڕەخ وان هەردو بسکان ڤە یێن وەکی خەزالان د سڤک، ئەو بسکێن بێنا عەنبەرێ ژێ دفرت و بەلاڤ دبت.

**دو زولفێت عەنبەر ئەفشانن**
**دو لەعلێت شەککرستانن**
**عەقیق و دوڕ و مەرجانن**
**ل حەوضان ئابێ حەیوان تێت**

(لەعل) جەوهەرەکێ سۆرێ ب بهایە، ل نک شاعرێن کلاسیک وەک ئستیعارە بۆ لێڤان دئێتە ب کارئینان، و (ئابێ حەیوان) ئاڤا حەیاتێیە، ئەوا د ئەفسانەیان دا دئێتە گۆتن کو هەچییێ ژێ ڤەخۆت نامرت، و هەر و هەر دێ زێندی مینت.

هەردو زولفێن یارێ بێنا عەنبەرێ ژێ دفرت، و لێ بەلاڤ دبت، و هەردو لێڤێن وێ یێن سۆر و ب بها وەکی لەعلان هندی دشرینن دێ بێژی شەکرستانن، و وەکی عەقیق و دوڕ و مەرجانان ب بهانە، و ل برکێن وان لێڤێن لەعلین ئاڤا حەیاتێ هەیە، ئەو

ئاڤا هەچییێ هندەکێ ژێ ڤەخوٚت زێندیبوونا هەر و هەر دێ ب دەست خوٚ ڤە ئینت.

**عەجیب بورکە مراری تێ**
**ل سەددێ قەوسێ تاری تێ**
**سیەهـ پەنجێن خوماری تێ**
**ژ مەخموران دو ئەصلان تێت**

ئەڤە سالوٚخەتێ دەڤ و بروی و چاڤێن یارێیە، دبێژت: ئەو برکا ئاڤا حەیاتێ لێ هەی، یا کو د مالکا بوٚری دا بەحس ژێ هاتییەکرن، و مەخسەد پێ دەڤە، برکەکا عەجێبە، ژ بلی کو ئاڤا حەیاتێ ژێ دزێت، ئەو یا تژییە ژ دورٖ و مراربیێن ب بها، و ئەو ل ڤێرێ ئستیعارەنە بوٚ ددانێن وێ یێن سپی، و د سەر دا هندەک کڤانێن رٖەش و تاری هەنە، د بن دا ئەو چاڤێن رٖەش هەنە یێن کو هەر چەندە وەکی مەستان دلاوازن ژی بەلێ ئەو وەکی پەنجان دلان نێچیر دکەن، ژ وان چاڤێن مەست دو شێر دئێن و دلێ مە نێچیر دکەن.

**ژ مەخموران تو مەخمووری**
**ب جی هێشت عەقرەبا زوٚری**
**طەوافا بەیتێ مەعمووری**
**ل بورجان خوون ب سەیران تێت**

د ڤێ مالکێ دا شاعر بەحسێ چاڤ و پەرچەم و نیشانا دلبەرێ دکەت، و دبێژت: ژ ناڤبەرا هەمی مەست و مەخموران

چاڤێن تەنە -ئەی دلبەرێ- مەخموورێن مە، و ئەو پەرچەما ل ژۆرییا ئەنییێ خوار وەکی کوورییا دوپشکی، ل جهـ مایە، و قستا طەوافا بەیتا مەعموور ناکەن، و ل دۆر نازڤرن، و بەیتا مەعموور کو د بنیات دا ئەو مالە یا ل عسمانێ دنیایێ ملیاکەت طەوافێ لێ دکەن، کانێ چاوا مرۆڤ ل دنیایێ طەوافا بەیتا حەرام دکەن، ل ڤێرێ کینایەتە بۆ نیشانا دێمێ، ل جهێ وەکی بورجان بلند، کو ئەو ئەنییە یا پەرچەما خوارا وەکی دوپشکی لێ هەی، خوینا مە عاشقان ئەوا ب پەرچەمێ ڤە مایی دئێتە خوارێ.

**عەقارب هات و بێ حەد هات**
**ل وێ بورجا زەبەرجەد هات**
**ڤ بالا قەوسێ ئەسوەد هات**
**ل طەلبەی ماهێ تابان تێت**

زەبەرجەد گەوهەرەکا ب بها و ناڤدارە، ژ جوینێن زوموررودێیە، و ئەو ل ڤێرێ ئستیعارەیە بۆ ئەنییێ، و (ماهێ تابان) هەیڤا گەشا خودان تاڤ و رۆناهییە، و مەخسەد پێ دێمە، دبێژت: زولف و پەرچەمێن خوار وەکی کوورییا دوپشکی بێ حەد و هەژمارن هاتن، و ل دۆر ئەنییا کەڤرا وەکی زەبەرجەدێ کۆمبوون، و چوون ل بالا گەهشتنە کەڤانێ رەشێ بروییێ، و ئەو هەمی پێکڤە د داخوازا دێمێ گەشێ وەکی هەیڤێ هاتن.

**ل هــــەیڤا کەوچـــەرین کامـــل**
**ڤ ئـــــەهلان ڕا نەهێشــــتن دل**
**وە جوملـــە دا صـــەفێن ســـونبول**
**ل هنـــــداڤی گولســــتان تێــت**

هەیڤا کەوچەرین ئەو هەیڤا تمام و زەلالە یا کەو ل بەر تاڤا وێ دچەرن، و هندەک جاران ئەو بۆ هەیڤا ئێکێ ژ پائیزێ ژی کو ئەیلوولە دئێتە گۆتن، و هەیڤا کەوچەرین و کامل کینایەتە ژ دێمێ دلبەرێ یێ گرۆڤر و گەش، دبێژت: ئەو بسک و پەرچەم د گەل کڤانێ ڕەشێ برووییێ ب سەر هەیڤا دێمی دا هاتنە خوارێ، و وان ب وێ چەندێ چو دل بۆ خودانان نەهێلان، و وان بسکان پێکڤە خۆ دانە ئێک و هندەک ڕێزێن سونبولان ژ خۆ دانە چێکرن، و ئەو ل هنداڤی گولستانا دێمی هاتن.

**گولســـــتانا خـــــودا ڕســـــتە**
**ل چـار ئـەطراف دلان خوەسـتە**
**بنـــەفش و نێرگـــزا مەســــتە**
**جنسری لـەعل و ڕەیحـان تێت**

ل وێ گولستانا خودایێ مەزن ڕستی و چێکری، و ب جەمالەکا بێ وێنە خەملاندی، ل هەر چار لایان دلێن عاشقان لێ کۆمبوون و داخوازا وێ کرن، ل وێ گولستانێ بنەفش و نێرگزا زراڤ یا وەکی مەست و سەرخۆشان دهژییێت و گول

نەسرین و لـەعل و رحـان لـێ هەنـە. و ئەڤـە کینایـەتن ژ بسـک و چاڤ و دێم و لێڤ و کەزییان.

**رەیـــاحین سووســـــن و وەردن**

**وە رەســـــتێ ئەحمـــەر و زەردن**

**ل شێخ عـەلییێ غـەریب فـەردن**

**هەرۆ سـەد جار د ئـەفغان تێت**

زولفێن یـارێ یـێـن وەکـی ڕەشــە رحانـان، سووسـن و گـولێن بێندارن، و ئەو ژ ڕەنگ و جوینێ سۆر و زەرن، و ئـەو ل بـەر دلـێ شێخ عەلـییێ حەریری دغەریب و فـەردن، یەعنی: وەکـی وانـە یـێن کەسـێ نـەدیتین، لـەوا دەمـێ ئـەو وان دبینـت و د جوانییـا وان دفوکرت، هەر ڕۆژ سەد جاران هەوار و فیغان ژ وی بلند دبن.

**ژ ئـــەفغانان نـــەمایم تێـــر**

**ببینـــە شـــەڕ دوا صـــولح دێـــر**

**دوعـــاگۆیێ تـــو ئـــەز بێڤێـــر**

**حـەتا ڤ قاصـدێ جـان تێـت**

ڕێزکـا دویـێ ژ ڤـێ مـالـکـێ: (ببینـە شـەڕ دوا صـولح دێر) ب تـەمامی ل بەر من یا ئاشکەرا نینە، ژ بلی وێ مـەعنایا مـالکێ ب ڤـی ڕەنگییە: ئەز ژ بەر نالین و فیغانـان تێـر نەمایمـە زێنـدی، و ئـەزێ نەخۆش و خەستە هەردەم دوعاگۆ و داخوازکەرێ تەمە، هـەر ژ ڤێ گاڤێ و حـەتـا قاصدێ رحێ کـو ملیاکـەتێ مرنێیـە ب سـەر من دا بێت.

(بێڤێر) پەیڤەکا کوردی یا کەڤنە ب مەعنایا مرۆڤێ نساخ و نەخۆش دئێت، مەلایێ جزیری ژی د شعرەکا خۆ دا دبێژت:

هەر چ بیڤێرێ کو ناڤێ دلبەرێ بێتن ل سەر
خوەش دبت هادر د گاڤێ بێ گومان و شوبهەیە

یەعنی: تشتەکێ بێ گومانە کو هەر نەخۆشەکێ ناڤێ دلبەرێ ل سەر بێتە خواندن، د گاڤی دا ئەو دێ خۆش بت.

**ببینـــــــە رووشـــــــەمالینی**
**وەرە هنـــــــداڤی بـــــــالینی**
**ژ دەســـت ئاهـــان و نـــالینی**
**چ ڕەنگ فریاد ژ عسمان تێت**

دیارە گۆتن ل ڤێرێ بۆ دلبەرێیە، دبێژتێ: تو وەرە عاشقێ خۆ ببینە ئەوێ ڕویێ وی ژ نەخۆشییان دا وەکی شەمالکێ حەلیای و سۆتی، و وەرە هنداڤی وی نساخێ سەرێ وی هەردەم ل سەر بالگەهێ، دا بزانی کانێ ژ بەر ئاه و نالینان ڤێری و هەوارێن وی ب چ ڕەنگ ژ عسمانان ڤە دئێن، یەعنی: چاوا هەوارێن وی بلندبووینە و گەهشتینە بەر پەڕێ عسمانی. ل شوینا (چ ڕەنگ) د دانەیا (کەشکۆلا دیوانا جزیری) دا: (چ دەنگ) هاتییە.

**ب فریـــــاد و ب هـــــاوارە**
**ژ دەست ئاهان من ئەو کارە**
**مـــــــولازم بەنـــــــدەئێ ژارە**
**ژ ســـەییدی چ فـــەرمان تێـــت**

ئەو عاشقێ نەخۆش یێ ب ڤێڕی و هەوارە، و ژ بەر ئاهـ و نالینان بەردەوام کارێ مە هەر ئەوە، یەعنی: فریاد و هەوارە، و هەرگاڤ ئەڤ بەندە (و شاعری بەحسێ خۆیە) یێ ژار و بەندەوارە، و چاڤەرێیی هندێیە کانێ چ فەرمان دێ ژ نک سەییدێ وی ئێت؛ دا ئەو وێ فەرمانێ ب جهـ بینت.

سەییدێ حەق نەظەر ڤێرا
ت ئقلیمان عەلەم گێرا
قطارا گەوهەران ڤێرا
ژ نێڤ کانا بەدەخشان تێت

سەییدێ وی کو سەییدێ ژ ڕاستی و دورستییە، دیتنەکا تمام و پێکهاتی ڤێرا هەیە، لەو هەر فەرمانەکا ئەو بدەت یا د جهێ خۆ دایە، و وی د هەمی وەلاتان دا ئالا گێڕایە، و ناڤ و دەنگێن وی ب کارینەجهی و حکمەتێ بەلاڤبوویە، و قیطارا گەوهەر ب وی ڕا هەیە، دێ بێژی ئەو یێ ژ ناڤ کارا وەلاتێ بدەخشانێ دئێت.

و کانا بدەخشانێ، یەعنی: جهێ گەوهەرێن ناڤدارێن وەلاتێ بدەخشانێ لێ هەین، مەخسەد پێ دێم و بەژن و بالایا خۆشتڤییە ئەوا تژی ژ دوڕ و گەوهەران، و قیطار ب ڕێزکرنا تشتییە ل دویڤ ئێک، یەعنی: خۆشتڤی هند گەوهەر ڤێرا هەنە کو وەکی قیطارێ ب ڕێز بوونە و کەفتینە دویڤ ئێک.

**بدەخشـــانان كـــو گەوهـــەر دا**
**ب قنطـــــار نـــــەختيان زەر دا**
**دەلالـــەت دەينـــێ ئەكبـــەر دا**
**ژ ئقليمـــێ هندســـتان تێـــت**

ديم و بەژن و بالايا خۆشتڤى ئەوا تێر گەوهەر، ب قينطـاران يەعنى: ب هژمارەكا مەزن زێرێ زەر ددەن، تشـتێ هنـدێ دگـەهينت كو ئەو دەينێ مەزنتر يـێ جوانـيـيـا خـۆ ددەن، و ژ بـەر خـەمـل و خێـز و جوانييا خۆ دێ بێژى ئـەو يـێ ژ هـەرێما هندستانێ تێت، لەو هندە دورِ و گەوهەر و زێرِ و زينەت پێڤەنە.

**خـــەراج كـــر كشـــوەرێ هنـــدى**
**ل كشـــمير چاڤرەشـــێ جنـــدى**
**ل مـــــەحبوويا ســـــەمەرقەندى**
**هەزار رِەنگ توحفە ئحسان تێت**

وى خۆشـڤييێ چـاڤرەش و جنـدى، يـەعنى: لاوتـازە، وەلاتـێ هندستانێ و كشميرێ ژى كرنە خەراج و خەلاتێ جوانييا خۆ، هزار رِەنگ تـوحـفـە و تشتێن عنتيكە يێن كـەسێ نـەديتين وەک خـەراج و ديارى بۆ مزگينييا خۆشتڤييێ مە يێ سەمەرقەندى دئێنەدان.

مـــەعنا: خۆشـــتڤييێ مـــە هێژايـــى هندێيـــە مـــرۆڤ وەلاتـــێ هندسـتانێ و كشـميرێ قوربـانى وى بكـەت، و ب هـزاران توحفـە و مالێ ب بها گۆرى هاتن و ديتنا وى بكەت.

هـەزار ڕەنـگ توحفـەئێ نـادر
هـەر سـال ژ نـوو بکـن حاضـر
...     ...     ...     ...
ژ تـەبرێز و خەراسـان تێـت

ئەڤ مالکە د بنیات دا یا کێمە، دبێژت: گەلی هەڤالان، هەر سال ژ نوی هوین هزار ڕەنگان ژ توحفەیێن نادر و مال و زینەتێ کەسێ نەدیتی ئامادە بکەن، د گەل وی مالێ ژ تەبرێز و خەراسانێ دئێت ژی؛ دا وەک باج و خەراج بدەنە خۆشتڤییێ مە.

خـەراجێ ئەصـفەهان دیسـە
ژ خواجـان خـالی مـان کیسـە
ژ بـۆ شـۆخا کـو بەلقیسـە
قوماشـێ کـەز ب تۆمـان تێـت

(خواجان) پەیڤەکا فارسییە بۆ سەیدایان هەر وەسا بۆ بازرگانان ژی دئێتە گۆتن، و (کەز) ئاڤرمیشە (حەریرە) بەلکی ژ (قەز) هاتبتە وەرگرتن کو ناڤێ وی کرمییە یێ داڤێن وی چێ دکەت، و بەلکی ژی د بنیات دا (گەز) بت، یەعنی: ئەو قوماشێ گەزەکا وی ب تۆمانان دئێتە کڕین، و (تۆمان) پوولەکێ ئیرانییان بەرانبەر هزار دینارێن زێڕی بوو. خۆشتڤییێ مە ئەوە یێ خەراجێ ئەصفەهانێ ژی د گەل یێ تەبرێز و خەراسانێ بۆ دئێتەدان، نە بەس هندە.. بەلکی تێڕ و کیسکێن بازرگانان هەمی ژ مالی ڤالابوون،

هندی وان مالێ خۆ وەک باج و خەراج داییێ، و بۆ شۆخا مە یا کو د هەیبەت و سەلطەنەتا خۆ دا وەکی بەلقیسایا شاها وەلاتێ سەبەئێیە، پەڕۆکێ ئاڤرمیشی ب بهایەکێ گران دئێتە ئینان.

**قوماشێ کەز ب سەد زێڕی**
**ت بەر بەژنا پەری چەهری**
**خەبەر چوو حاکمێ ژێری**
**ل ڕی و بار ب سەیران تێت**

پەڕۆکێ ئاڤرمیشی یێ ب سەد زێڕان دئێتە کرین، یان گەزا وی ب سەد زێڕان، ل بەژنا دلبەرا پەریڕوویێ دئێت، و هەژی وێیە، و ئەڤ دەنگ و باسە ژ دلبەرا مە بەلاڤبوویە و خۆ چوویە گەهشتییە حاکمێ ژێری ژی، یەعنی: یێ دویر، و ئەو خەبەر ل ڕێ و ڕێباران و د گەل ڕێڤنگان دئێت و دچت.

**دەور وی هات حەریر قۆمە**
**ژ زیڤ و زێڕ کرە کۆمە**
**خەبەر چوو حاکمێ ڕۆمە**
**ب کەشتێ خەرجیان وان تێت**

هەر چەندە مەعنایا ڤێ مالکێ ب تمامی ل بەر من یا ئاشکەرا نینە، نەخاسم پەیڤا ب کەشتێ (پەکشتی) د بنیات دا نوقطەیەکا حوبری یا کەفتییە سەر و ئەم ژ خواندنا وێ دپشتڕاست نینن، بەلێ دبت مەعنا ب ڤی ڕەنگی بت: دەور هات کو قەوم و مللەت پەڕۆکێ حەریری بۆ وی خۆشتڤی وەک خەراج بینن، و

کۆمەکا مەزن ژ زێڕ و زیڤی بدەنێ، و ئەڤ خەبەرە هند بەلاڤبوو حەتا چووی گەهشتییە حاکمێ رۆمێ ژی، و وی ژی خەرج و خەراجیێن ب کەشتی و پاپۆڕان بۆ خۆشتڤییێ مە هنارتن. و بەلکی حاکمێ ژێری ئەوێ بەری نوکە بەحس ژێ هاتییەکرن هەر حاکمێ رۆمێ بت.

**ئەمر وێ هات ژ خوندکاری**

**ل رۆمێ حوکمی کر جاری**

**خەراجا زەنگیان باری**

**ل مصرێ و حەتا وان تێت**

ئەمر و فەرمان ژ خوندکار و سولطانێ مە یێ مەزن هات، کو خەرج و خەراج بۆ وی بێنە کۆمکرن، و ئەڤ حوکمە نە ب تنێ ل وەلاتێ مە ب جه هات، بەلکی خۆ ئەو ل ناڤ رۆمێ ژی جاری بوو و کار پێ هاتەکرن، و خەراج ژ وەلاتێ زەنگییان ژی ل وی باری و هات، بەلکی خۆ ژ وەلاتێ مصرێ و حەتا وانێ ژی خەرج و خەراج بۆ هاتنە کۆمکرن.

و دەمێ ئەو دبێژت: خەراج ژ ڤان هەمی وەلاتان بۆ خۆشتڤییێ مە دئێت، مەخسەدا وی ئەوە ل دنیایێ هەمییێ کەسەک وەکی خۆشتڤییێ مە یێ خودان دەسهەلات نینە، و ئەڤ دەسهەلاتا وی ژ هندی دئێت کو جەمالا وی ل هەمی جهان یا بێ وێنەیە.

**ل حەلەب شووشەئێ دەند تێت**
**ت گەل ئابا فەرەحمەند تێت**

... ... ... ...

**ل بۆ شاهێ د شاهان تێت**

رێزکا سێیێ ژ ڤێ مالکێ د بنیات دا نەهاتییە و جهێ وێ مایەڤالا، و مەعنایا هەر سێ رێزکێن مایی ئەڤەیە: ژ حەلەبێ ئەوا ب ناڤ و دەنگ ب چێکرنا شویشەیی رەنگەکێ شویشێن دەند بۆ خۆشتڤییێ مە وەک خەراج دئێت. و (دەند) بەلکی مەخسەد پێ ددانک بت، یەعنی: ئەو شویشەیا ب رەنگەکێ وەسا هاتییە چێکرن کو وەکی ددانکان پێڤە هەی، و بەلکی ژی د بنیات دا (رەند) بت، یەعنی: شویشەیا جوان و تازە، و د گەل ڤێ شویشێ یان د ناڤ وێ دا ئاڤەکا دلخۆشکەر ژی دئێت، یا خودان پێ کەیفخۆش دبت، و ئەڤە هەمی بۆ شاهێ شاهان، کو خۆشتڤییێ مەیە، دئێن.

**تو شاهێ جوملەئێ شاهی**
**ب حەققێ ئسمێ ئەللاهی**
**نەکی مەنعم ل دەرگاهی**
**کو ئەو مەجنوونێ ئاسان تێت**

ئەی خۆشتڤییێ مە، تو شاهێ هەمی شاهانی، لەو ئەڤ هەمی خەراجە بۆ تە دئێت، ڤێجا ئەز تە ددەمە سویندێ ب حەققێ ناڤێ خودێ کو تو مەنعا من ژ دەرگەهێ خۆ نەکەی، و

من ژ دیتنا خۆ بێبار نەکەی، و تو بڕیارا خۆ بدە کو ئەو شێت و شەیدایێ ڤینا تە، کو ئەزم، ب ساناهی و هێسان بێت و ب دیتن و حوضوورا تە شاد ببت.

**حـــەریری گـــەر چ حەیرانـــە**
**ل مـــەدحێ تـــە شـــەش ئەزمانـــە**
**دوعـــــاگۆ و ســـــــەناخوانە**
**حـــەتا ڤ قاصـــدێ جـــان تێـــت**

شێخ عەلییێ حەریری ئەگەر چ حەیران و سەوداسەرێ عشقا تەیە ژی، بەلێ ئەو د مەدحا تە دا یێ شەش ئەزمانە، یەعنی: هەردەم ب شەش ئەزمانان ئەو مەدحا تە دکەت، و ژ دەر حەق تە دەرناکەڤت، و هەمی گاڤان ئەو دوعاگۆ و سەناخوانێ تەیە، هندی ئەوێ زێندی بت و حەتا کو قاصدێ رحێ، کو ملیاکەتێ مرنێیە، دئێت و رحا وی دستینت.

## شعرا سێیێ

هەچی شەیخ و موریدن کو دبێژن قەط وە ناکم ئەز
ئەگەر رووحم دکن غارەت ژ بادێ تەوبە ناکم ئەز
بلا ساقی مەیێ بینت بنۆشم ئەز ب یاران ڕا
ژ کەربێ جوملە سالووسان دەرێ کۆیان رەوا کم ئەز
هەچی شەملک ل سەر پێچا و لاچک لفکە ژێ بەردا
ئەگەر صنگی د خۆ ڕا کەت دبێ صاحب سواکم ئەز
مەکەن باوەر ب سەرکەسکان ئەگەر شاشک ژ نوورێ بت
د گەل کذبێ دبت کافر دبێژت ئەصلێ پاکم ئەز
ژ سەرکەسکان مەکەن باوەر د جەهلێ دا دبن کافر
دبێن ئەز شەیخێ صەنعانم ب جارەک قوطبێ چاکم ئەز
هەچی سەرکەسک ببینن هوون ب سەووادی سەری ژێکن
ئەگەر وارث دکن دەعوا جەوابێ دێ ئەدا کم ئەز
ئەوی شیرێ سەقاکردی ل دەست دگرم ل مەیدانێ
ب سەرکەسکان دجەرپینم عەلی ژیک دێ غەزاکم ئەز

## هەچی شەیخ و موریدن

شێخ عەلییێ حەریری ئەڤ شعرا خۆ ل سەر وەزنا (هەزەجێ) ڤەهاندییە یا هەر مالکەک تێدا ژ هەشت تەفعیلەیان پێک دئێت، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییە: (مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ مَفَاعِیْلُنْ)، و مە ئەو ژ دەستنڤیسا کەشکۆلا دیوانا مەلایێ جزیری وەرگرتییە، و ئەو د دەستنڤیسا سەیید ئیبراهیمێ بێسکی ژی دا هاتییە، بەلێ مخابن ئەو پەرێ شعر تێدا هاتی یێ کەفتی و ب تنێ مالکا ئێکێ گەهشتییە مە، و سەیدا صادق بەهائەددین ئامێدی ژی دانەیەک ژێ د کتێبا خۆ (هۆزانڤانێت کورد) دا بەلاڤکرییە.

ناڤەرۆکا ڤێ شعرێ ل دۆر مژارەکا رەخنەیی دزڤرت، حەریری رەخنەیەکا دژوار ل وان شێخ و موریدان دگرت یێن خۆ ب کراسەکێ درەوین نیشا خەلکی ددەن، یەعنی: ژ دەور خۆ دکەنە شێخ و وەلی، و خۆ ب کرامەتان دئیننەدەر، و ب ناڤێ زوهد و تەقوایێ دئاخڤن ئەو ب خۆ درەوێ ل خەلکی دکەن، و نیفاق و دوروییاتییێ ب کاردئینن.

عەلییێ حەریری دبێژت:

**هەچی شەیخ و موریدن کو دبێژن قەط وە ناکم ئەز**

**ئەگەر رووحم دکن غارەت ژ بادێ تەوبە ناکم ئەز**

هەچی تشتێ ئەڤ شێخ و موریدێن ژ درەو دبێژن و خەلکی پێ دخاپینن ژ وەعظ و شیرەتێن تژی نیفاق، ئەز قەت گوهدارییا وان ناکەم، و ب گۆتنا وان ژی ناکەم، دەمێ ئەو داخوازێ ژ من دکەن کو ئەز مەیا عشقێ بهێلم، و پشت بدەمێ، و خۆ ئەگەر ئەو هێرش و غارەتێ بدەنە سەر رحا من و وێ ژ من بستینن ژی، ئەز گوهدارییا وان ناکەم و ژ ڤەخوارنا مەیا عشقێ تەوبە ناکەم، و ناچمە سەر مەزهەبێ وان.

**بلا ساقی مەیێ بینت بنۆشم ئەز ب یاران را**

**ژ کەربێ جوملە سالووسان دەرێ کۆیان رەوا کم ئەز**

ساقی کینایەتە ژ مەحبووبێ حەقیقی ئەوێ مەیا عشقا خۆ ل سەر عاشقان بەلاڤ دکەت، و (سالووس) ڕیمەتکارێ خاپینۆکە ئەوێ ب ئەزمانێ خۆ یێ خۆش و حولی خەلکی د سەر دا دبەت، و (رەوا) کورتییا (رەوان)ە و مەخسەد پێ خۆش و ساناهییە، ئاڤا رەوان ئەو ئاڤە یا ب ساناهی و خۆش د گەروییێ دا دچتە خوارێ.

شاعر دبێژت: بلا خۆشتڤییێ مە مەیا عشقا خۆ بینت و بدەتە مە؛ دا ئەز و دۆست و یار وێ د گەل ئێک ڤەخۆین، و ژ کەربێن وان هەمی منافق و ڕیمەتکارێن خاپینۆک دا ئەز دێ وان کۆپ و جامان ڤەخۆم و ب ساناهی و خۆش فڕکەم.

**هەچی شەملک ل سەر پێچا و لاچک لفکە ژێ بەردا**

**ئەگەر صنکی د خۆ را کەت دبێ صاحب سواکم ئەز**

ئەڤــە ژی بەحســێ هنــدەک شــێخێن ژ درەون (موتەشــەییخ) ئەوێن گرنگییێ ددەنە (مەظـهەری) و (جەوهەری) ژ بیرا خۆ دبەن، و ئارمانجـا خـۆ دکەنــە خاپانـدنا خـەلکێ سـادە، (لاچـک) یـان (لـەچـک) دەرسـۆکـەکـا سێگۆشەیە ژن دکەنە سـەرێ خـۆ، و دیـارە ل سەر دەمێ عەلییێ حـەریری هندەک شێخان ژی ئـەو ددانـا سـەر سـەرێ خـۆ و لفکـا وێ ب نـاڤ ملـێن خـۆ دا بـەردا. (سـنگ، صـنگ) ئاسـنەکە د عـەردی دقـوتن و شـلیتا خیڤـەتان، هـەر وەسـا هەڤساری دەواران پێڤە گرێددەن.

شـێخ عــەلییێ حــەریری دبێــژت: هــەچی کســەکێ هــات و شەملەک د خۆ پێچا، و دەرسۆکەک هاڤێتە سەر سەرێ خۆ و لفکا وێ ب ناڤ ملێن خۆ دا بەردا، و صنگەکی د خۆ ڕا بکەت، دێ بێژت: ئـەز خـودان سـیواکم! یـەعنی: نـە هـەر ئێکـێ خـۆ ب کراسـێ شێخان نیشا خـەلکی بدەت، شـاش و لفـان گرێـدەت، و سـیواکەکا ستویر یـا وەکـی صـنگی د دەڤـی خـۆ ڕا بکـەت، و خـۆ ب تـەقوایێ نـیشـا خـەلـکـی بدەت، دڤێت هوین باوەر ژێ بکـەن، نـە.. گەلـەک ژ ڤــان ڕەنگــە مرۆڤــان درەوان دکــەن و ئارمانجــا وان خاپانــدنا مرۆڤێن دلپاک و سادەیە، ڤێجا هوین لێ دهشیار بن.

**مەکەن باوەر ب سەرکەسکان ئەگەر شاشک ژ نوورێ بت**

**د گـەل کـذبێ دبـت کـافر دبێـژت ئەصـلێ پـاکم ئـەز**

ئـەو كـەسێـن ژ درەو خۆ دکـەنـە سەيید، و شاشکێن کەسـک د سـەرێ خـۆ دئالـینن؛ دا خەلکی بخاپینن، و مـالێ وان ب حیلـە و حـەوالان ببـەن، هوین باوەر ژێ نەکەن، ئەگەر خۆ شاشـکێن وان ژ ڕۆنـاهـیـیـێ بـن و نوورهە ژێ بچت؛ چونکی ئـەو درەوان دکـەن، و د گـەل درەوێ ئـەو کـافریـیـێ ژی دکـەن، سێرەبەندی وفێلبـازییێ ل فەقیر و ژاران دکەن، و د گەل هندی ژی ئێک ژ وان دبێژت: ئەز ژ ئەصـــل و هێڤێنـــەکێ پـــاکم، و بنیـــاتێ مـــن ژ نەســـلا پاکـــا پێغەمبەرییە -سلاڤ لێ بن- و ئەز سەییدم.

**ژ سەرکەســکان مەکــەن بــاوەر د جــەهلێ دا دبــن کــافر**

**دبێن ئەز شەیخێ صەنعانم ب جارەک قوطبێ چاکم ئـەز**

هوین بـاوەر ژ ڤـان سـەییدێن درەویـن نەکـەن، ئـەوێن ژ قەستا شاشکێن کەسک دانانە سەر سەرێن خۆ؛ چونکی ئـەو د جـەهل و نەزانینا خۆ دا نقۆ دبن، حەتا کو د سەر دا دچن و کافر دبن، ئێـک ژ وان دبێژت: هەما ئەزم شێخێ صەنعانی، نە کەسێ دی!

د دانەیا (ئامێدی) دا: (شێخێ صـافی) هاتییـە، یـەعنـــی: شێخێ صـافی هەر ئەزم، و ئەز ب جارەکێ قوطبێ چـاکم، و کـەس نـە د ســەر مــن ڕا هــەیـە و نە د بەر من ڕا.. و ئـەو ب خۆ حـال چ حالـە؟ وی جاهلی یا خلاصکری!

**هەچی سەرکەسک ببینن هوون ب سەووادی سەری ژێکن**

**ئەگـەر وارث دکـن دەعـوا جـەوابێ دێ ئـەدا کـم ئـەز**

هەر سەرکەسکەکێ ب وی ڕەنگی بت یێ مـن بەحس ژێ کری، گاڤا هەوە دیت، هوین ب (سەووادی) سەرێ وی ژێ ڤەکەن، و وی بکوژن، و ئەگەر میراتگرێن وی هاتن و دەعوا ل هەوە کر و داخوازا خوینا کوشتییێ خۆ کر، ئەز دێ پێش هەوە ڤە جەوابێ دەم، و بۆ وان ئاشکەرا کەم کو ئەو مرۆڤێ وان یێ هێژایی کوشتنێ بوو. و بەلکی مەخسەدا وی ب (سەووادی) شیر بت، وەکی ژ مالکا بێت ئاشکەرا دبت.

**ئەوی شیرێ سەقاکردی ل دەست دگرم ل مەیدانێ**
**ب سەرکەسکان دجەڕبینم عەلی ژیک دێ غەزاکم ئەز**

ئەوی شیرێ سەقاکری و خۆش، یێ من داخواز ژ هەوە کری کو هوین وان سەرکەسکان پێ بکوژن، ئەز دێ ل مەیدانێ ب دەستێ خۆ گرم، و غەزایا سەرکەسکان پێ کەم، و ل ستوێ وان جەڕبینم.. حەتا کو غەزایا (عەلی) ب خۆ ژی ئەز دێ پێ کەم!

ئەڤ ڕستەیا دووماهییێ ئحتیمالا دو مەعنایان ددەت، یا ئێکێ: ئەگەر عەلی ژی وەکی وان سەرکەسان بت، ئەز دێ غەزایا وی کەم و وی ژی پێ کوژم. یا دویێ: ژ قەبیلێ تەواضوعێ ئەو دبێژت: ئەز دێ غەزایا عەلی ژی پێ کەم؛ چونکی ئەو ژی ئێک ژ وان سەرکەسکانە!

## شعرا چارێ

گەر هوون ببینن نارێ عشق
تێن و ل بۆم زاری دکەن
گەر کەشف ببی ئەحوالێ عشق
بەخیل و دشواری دکەن
ب حالێ عشق بەخیل دبن
بێ راهـ و بێ دەلیل دبن
هەر دەم ب دەم زەلیل دبن
هەر کەس ب غەمخواری دکەن
هوون بار مەکەن غەمێ د زۆر
ل حەسرەتا وەردێ د سۆر
چاڤێ د ڕەش بسک تێنە دۆر
ئەنیێ ژ نوو تاری دکەن
ئەنیا شرین بسک تێنە سەر
ڕەنگین دبن شەمس و قەمەر
ڕەشمار ژ حەبسێ تێنەدەر
ل عەرعەرێ یاری دکەن

خوەش عەرعەر و شمشاد قەد
سۆتن ژ مـن جـەرگ و كەبـەد
داد و مـــەدەد داد و مـــەدەد
چەشـــمان چ خومـمـــاری دكـــن

جۆتێ خومار ئەز بووم هەدەف
تەفسير دكەن صونعێ صەدەف
ڕۆژ خەمللی هەر چار طـەرەف
ب مســـكێ تاتـــاری دكـــەن

بســـكێ ل ڕۆژێ بوونـــه كـــۆم
جامـــا مـــەیێ ئينـــان ل بـــۆم
ئـــــەمر دكـــــر لازم ڤـــــەخۆم
مەســـتی ل مـــن جـاری دكـەن

مەســـتێ شـــەرابێ قەندلـــەبێم
ئەســـيرێ بەنـــدێ وێ شـــەبێم
وەصـــفێ د عشـــقێ گـــەر بێـــم
هـوون تـــەركێ هشـــياری دكـەن

هۆشـــم چـــوين مـــايم نـــەهۆش
ئەز دەم ب دەم لـەو تێمە جۆش
ميـران قـەوی ذەوق و خـورۆش
پيشـــەئێ خونـــدكاری دكـــەن

پیشـــەئێ وان دان و کـــەرەم
خدمـەت دکـەن کـورد و عەجـەم
مەزیـــدێ عشـــقێ دەم ب دەم
ب نەقشـــێ جـــەبباری دکـــەن

نـــەقش و نگـــارێ ناقشـــان
دیـــوان و صـــەففێ چاوشـــان
هەیهـــەی ل جـــۆتێ پادشـــان
عەجـــەب چ ســـەرداری دکـــەن

ســـەردارێ شـــاهێ رەونـــەقان
مـــوعجز و رەمـــزێ ئەبلـــەقان
عـــەلیۆ مـــە بێـــژە ئەحمـــەقان
بـــازارێ ئنکـــاری دکـــەن

# گەر هوون ببینن نارێ عشق

ئـەڤ شـعرە ل سـەر وەزنـا (رەجـەزا هەشـتـەیی) یـا هاتییـە ڤەهانـدن، و قـالبێ وێ ب ڤـی رەنگییـە: (مُسْـتَفْعِلُنْ مُسْـتَفْعِلُنْ مُسْـتَفْعِلُنْ مُسْـتَفْعِلُنْ)، و مـە ئـەو ژ سـێ ژێـدەران وەرگرتییـە: دەستنڤیسـا شـێخ ئەحمـەدێ فـەقیرێ گوندشـێخی، و دەستنڤیسـا کەشکۆلا دیوانا جزیری (کو نـاڤێ نڤیسـەری ل سـەر نەهاتییـە)، و کتێبـا بووژاندنـەوەی مێـژووی زانایـانی کـورد) یـا سـەیدا محەمـەد عـەلی قـەرەداغی و وی ئەو ژ دەستنڤیسـا مـەلا عـەلییێ سووسنی وەرگرتییە.

مژارا سەرەکی یا ڤێ شعرێ ل دۆر وێ سـۆتنییێیە یـا ئـاگرێ عشـقێ د دلـی دا پەیـدا دکـەت، و شـاعر هـەر ژ دەسـپێکێ خواندەڤانان ئاگەهدار دکەت کو ئەو ئێک ژ وان کەسانە یێن ئـاگرێ عشقێ بەربوویێ، و هەر کەسەکێ ئەڤ ئاگرە دیت بت، یان یـێ پـێ زانـا بـت، دێ ب حـالێ شـاعری ئاگەهـدار بـت، لـەو دێ گـری و زارییێ بۆ وی کـەت.. دا بـەرێ خۆ بدەینێ کـانێ سـەرهاتییا شـێخ عەلییێ حەریری د گەل عشقا وی چ بوویە؟

حەریری دبێژت:

**گەر هوون ببینن نارێ عشق**
**تێن و ل بۆم زاری دکەن**
**گەر کەشف ببی ئەحوالێ عشق**
**بەخیل و دشواری دکەن**

گەلی هەڤال و هۆگران! ئەگەر هوین ئاگرێ عشقێ ببینن، و پێ ئاگەهدار ببن دەمێ ئەو دکەفتە دلی و سۆتنییێ تێدا پەیدا دکەت، هوین هەمی پێکڤە دێ ئێن و گری و زارییێ بۆ من کەن؛ چونکی هوین دێ نزانن کانێ چەند حالەکێ نەخۆشە ئەز کەفتیمێ، و ئەگەر ئەحوال و نهێنییێن عشقێ ل بەر هەوە ئاشکەرا ببن، وەکی کو ل بەر من ئاشکەرا بووین، هوین ژی وەکی من دێ چرێک و دژوار بن، و د (کەشکۆلا دیوان جزیری) دا نیڤا دویێ ژ مالکێ ب ڤێ گۆتنێ دەست پێ دکەت: (هەر کەس بزانی حالێ عشق) و مەعنا یا ئاشکەرایە.

و بەلکی مەخسەدا وی ب چرێکییێ یا عشق ل نک خودانی پەیدا دکەت ئەو بت مرۆڤێ عاشق وە لێ دئێت حەز دکەت مەحبووبێ وی بۆ وی ب تنێ بت و کەس پشکدارییا وی تێدا نەکەت، لەو تو دبینی ئەو ل سەر ڤێ چەندێ توند و دژوار دبت.

پشتی ڤێ چەندێ شاعر بەحسێ وی سەر و بەری دکەت یێ عشق خودانێ خۆ دگەهینتێ، و دبێژت:

ب حـالێ عشـق بـەخیل دبـن
بـێ راهــ و بـێ دەلیــلِ دبــن
هــەر دەم ب دەم زەلیــل دبــن
هەر کەس ب غەمخواری دکەن

هـەر کـەسـەکـێ ب غـەمـخۆری ڤە بـەر ب عشـقێ ڤـە بچـت، و ب دورستی حالـەتێ عشـقێ ب سـەر دا بێـت، و ببتـە عاشـقەکێ دورسـت، ئـەو -وەکـی بـەری نوکـە ژی مـە گـۆتی- دێ بتـە کەسـەکێ چرِیک، و چونکی ئەو دێ بتە مرۆڤەکێ سەوداسەر رِێک دێ ل بـەر وی بەرزە بت، و وی چو رِێبەر نامینن بـەرێ وی بدەنـە ئارمـانجێ، لەو تو دێ بینی هەردەم ئەو یێ رەزیل و مەلویلە!

مەعنا عشق ئەگەر یا ژ دل بت، و عشقەکا رِاست و دورست بت، خودانی دئێختە بێگاڤییەکا دژوار، و تەنگاڤییەکا زێدە، حەتا کو رِێ ل بەر وی بەرزە ببن، و نەزانت دێ ب چ سەری چت.

هوون بار مەکەن غـەمێ د زۆر
ل حەســـــرەتا وەردێ د ســـــۆر
چاڤێ د رِەش بسـک تێنـە دۆر
ئــەنیێ ژ نــوو تــاری دکــەن

ڤێجا مادەم ئەڤە حالێ عشقێیە، شیرەتا مـن ل هـەوە -گـەلی دۆست و هـەڤالان- ئەڤەیـە هوین ب نـک عشـقێ ڤـە نـەچن، و خـۆ تـووش نەکـەن؛ دا بـارێ هـەوە تـژی نـەبت ژ خـەم و کۆڤـانێن زۆر، ڤێجا گرانییـەکا زێدە بکەفتـە سـەر ملێن هەوە ب رِەنگـەکێ وەسـا

هوین خۆ ل بەر نەگرن، ئەو خەم و کۆڤانێن دێ ل نک هەوە پەیدا بن ژ بەر حەسرەت و کەدەرا گولێن سۆر یێن دێ هەوە ڤێن و هوین نەشێن بگەهنێ، و گولێن سۆر ل ڤێرێ کینایەتە ژ ڕوییێ دلبەرێ یێ وەکی گولا سۆر، هەر وەسا ژ بەر وێ حەسرەتا چاڤێن ڕەشێن یارێ دەمێ بسک ل دۆرا وان کۆم دبن، و ب سەر ئەنییێ دا دئێنە خوارێ و ژ بەر ڕەشییا خۆ یا دژوار، وێ ئەنییا سپی و کەڤەر تاری دکەن و ل پشت خۆ ڤەدشێرن.

مەعنا: هوین بەر ب عشقا دلبەران ڤە نەچن؛ چونکی ئەو ژ بەر حەسرەتا جوانییا خۆ یا زێدە دێ بارێ هەوە ژ کول و کۆڤانان داگرن.

**ئەنیا شرین بسک تێنە سەر**<br>
**ڕەنگین دبن شەمس و قەمەر**<br>
**ڕەشمار ژ حەبسێ تێنەدەر**<br>
**ل عەرعەرێ یاری دکەن**

ئەڤە ژی هەر سالۆخدانا ئەنی و دێمێ دلبەرێیە، ئەوێ عشقا وان حەسرەتێ ل نک خودانی پەیدا دکەت، دبێژت: ئەو ئەنییا مە د مالکا دی دا بەحس ژێ کری کو دەمێ بسک ل دۆر کۆم دبن، وێ ل پشت خۆ تاری دکەن، گاڤا مرۆڤ وێ ئەنییا شرین دبینت، و د (کەشکۆلا دیوانا جزیری) دا: ئەنیا شەریف هاتییە، یەعنی: ئەو ئەنییا پیرۆز یا ڕۆناهییا حەق ژێ دپەشت، و د دانەیا

(سووسنی) دا: (ئەنیا ل نوور) هاتییە، یەعنی: ئەو ئەنییا ژ نووریَ هاتییە ئافراندن.

دەمیَ ئەنییا کەڤەر بسکێن شرین یان شەریف ب سەر دا دئێن، بسکێن رەش و تاری ب سەر دا دئێن، رۆژ و هەیڤ هەردو پێکڤە رەنگین دبن، و رۆژ کینایەتە ژ ئەنییا تژی رۆناهی، و هەیڤ گینایەتە ژ دێمیَ گەش و گرۆڤر، دبێژت: دەمیَ بسکێن دلبەریَ ل دۆر ئەنی و دێمیَ ویَ دزڤرن، ئەو وان دخەملینن و رەنگین دکەن، و دەمیَ رەشمارێن کەزییان وەکی گرتییان ژ بن خێلی و دەرۆسکیَ دەردکەڤن، و ئازاد دبن، ئەو ب سەر بەژنا زراف و راستا وەکی دارا عەرعەریَ دا دئێنە خوار، و ب نازکی دهژییێن دیَ بێژی ئەو ییَ یاری و سەماییَ دکەن.

**خوەش عەرعەر و شمشاد قەد**
**سۆتن ژ من جەرگ و کەبەد**
**داد و مەدەد داد و مەدەد**
**چەشمان چ خومماری دکن**

عەرعەر دارا هەڤرستێیە، و شمشاد دارەکا زراڤە نێزیکی هەشت متران یا درێژە، و ئەو هەردو ل ڤێریَ کینایەتن بۆ بەژنا دلبەریَ یا راست و زراف، شاعر دبێژت: بەژن و بالایا دلبەریَ یا راست و زراف وەکی دارا عەرعەر و شمشادیَ جەرگ و مێلاک ل من سۆتن، و د دانەیا (گوندشێخی) دا هاتییە: (ژ من رەڤان صەبر و خرەد) یەعنی: بەژن و بالایا ویَ هەدار و عەقل بۆ من

نـەهێـلان، لـەو بـەردەوام ئەز هـەوار دکـەم: داد و مـەدەد.. و کـەس د هەوارا من نائێت! بەلکی چاڤێن وێ یێن مەست و خومـار، ئـەو ژی دئێنه هـاری بـەژنـا زراڤ و ب مـەسـتـی نـازان ل مـن دکـەن، و ئێکجار جەرگ و مێلاکان ل من دسوژن.

**جۆتێ خومار ئەز بووم هـەدەف**

**تەفسیر دکەن صونعێ صـەدەف**

**ڕۆژ خەمللی هەر چار طـەرەف**

**ب مســـکێ تاتـــاری دکـــەن**

صەدەف ئـەو قالـکـه یـا لۆلـۆیێن سپی د زکـی دا، کـو ژ بنـێ دەریاریێ دئیننه دەر، دسپی و زەلال و ب بهانه، شاعر دبێژت: ئـەز یێ بوویمه ئارمانجێ جۆتێ چاڤێن دلبەرێ یێن مەست و خوماری، و بەردەوام ئەو ئاورێن خۆ یێن تیژ و دژوار د من وەردکـەن، و دلـێ مـن بریـندار دکـەن، و ئـەگـەر تـه بڤێت ڕاستییا زەلالـی و جوانی و بهایێ وان چاڤێن خوماری بزانـی، صـەدەفێن لۆلۆیـان وان شـەرح و تەفسـیر دکـەن، و د دانـەیا (گوندشـێخی) دا هاتییـە: (بکـەن) یـەعنی: گـەلی گوهـداران، هـوین وان چـاڤێن خومـاری ب صـونعێ صەدەفان تەفسیر بکەن؛ دا بزانن کانێ ئەو چەند ب بهانه.

ڕۆژ، و ئـەو ل ڤێرێ ئستیعارەیه بـۆ ئـەنـی و دێمـی، ژ هـەر چار لایان ڤه ب بسک و کەزی و پەرچەمان هاتـه خەملانـدن، ئـەو کەزی و بسکێن مسکا تەتاری یا ناڤدار ب بێنخۆشییا خۆ ڤـه لـێ هاتییه ڕەشاندن.

بســـكێ ل ڕۆژێ بوونـــە كـــۆم
جامـــا مـــەیێ ئینـــان ل بـــۆم
ئـــەمر دكـــر لازم ڤـــەخۆم
مەســـتی ل مـــن جـــاری دكـــەن

بسـك و زولـف ل دۆر دێمـێ وەكـی ڕۆژێ گـەش كۆمبـوون و تێـك ئـالییان، و وان جاما مەیێ ژ دەڤ و لێڤان بـۆ مـن ئینـا و فـەرمان ل مـن كـر كـو لازمـە ئـەز ڤـەخۆم، و ب ڤـێ چەنـدێ ئـەو مەستییێ ل مـن جـاری دكـەن، یـەعنی: مـن نـەچار دكـەن كـو ئـەز ب وێ جامێ مـەست و سەرخۆش ببم.

د دانەیا (كەشكۆلا دیوانا جزیری، و مەلا عـەلییێ سووسنی) دا ل شوینا (ڤەخۆم) پەیڤا (وەخۆم) هاتییە، و ئاشكەرایە كـو ئەڤـە لـەهجـەیا وان عـەشیـرەتانـە یێـن دكـەڤنـە سـەر توخـوبێ بادینـان و سۆران، و هزر بۆ هندێ دچت كو شێخ عـەلییێ حـەریری خـەلكێ وێ دەڤەرێ بوویە، وەكـی مـە ل پێشـییا ڤـێ كتێبـێ ئیشـارەت پـێ دای.

مەســـتێ شـــەرابێ قەندلـــەبێم
ئەســـیرێ بەنـــدێ وێ شـــەبێم
وەصـــفێ د عشـــقێ گـــەر بیـــێم
هـــوون تـــەركێ هشـــیاری دكـــەن

ئەز مـەست و سەرخۆشێ شەرابا وێ دلبەرێ مە یا لێڤێن وێ وەكی قەند و شەكرێ دشرین، و ئەز ئێخسیر و گرتییێ بەنـدا زولفـا

وێ یا ڕەشا وەکی شەڤێمە، ئەز نەشێم ژێ ڤەرەسم و ڕزگار ببم، و ئەگەر ئەز وەصف و سالۆخەتێ عشقێ بێژم و بۆ هەوە ڤەگێڕم، هوین ژی وەکی من دێ مەست و سەرخۆش بن، و هوین دێ هشیارییا خۆ ژ دەست دەن و هەوە ئاگەهـ ژ خۆ نامینت.

ئەڤ مالکە د دانەیا (گوندشێخی) دا ب ڤی ڕەنگییە:

مەست و شەرابێ قەندوی ئەسیر و بەندێ شەڤ دوی
گەر وەصفێت یارم دوی هوون تەرکێ هشیاری دکەن

و ئەوا مە ل سەری دانای بنەجهترە.

**هۆشم چوین مایم نەهۆش**
**ئەز دەم ب دەم لەو تێمە جۆش**
**میران قەوی ذەوق و خورۆش**
**پیشەئێ خوندکاری دکەن**

ژ بەر وێ عشقا ژێگۆتی عەقل و هشێن من یێن چووین و ئەزێ مایمە بێ هش و سەودا، لەو گاف بۆ گاڤێ جۆش و کەلین دئێتە من دێ بێژی ئاگرەکێ د هناڤێن من دا، و میر ژ بەر وێ دەسهەلاتا وان هەی، ب زەوق و تامەکا خۆش و دەنگ و دۆرەکێ بلند ڤە کار و پیشەیا سولطان و خوندکارێ مەزن دکەن. و ئەو کار و پیشە چییە؟ د مالکا بێت دا دێ بۆ مە بێژت.

و میر ل ڤێرێ ئستیعارە بۆ مەحبووبان، و بەلکی مەخسەد پێ مەحبووبێن مەجازی بت، و خوندکار مەحبووبێ حەقیقی بت.

**پیشـــەئێ وان دان و کـــەرەم**
**خدمـەت دکـەن کـورد و عەجـەم**
**مەزیـــدێ عشـــقێ دەم ب دەم**
**ب نەقشـــێ جـــەبباری دکـــەن**

پیشـەیا خونـدکاری یـا کـو میـر پـێ ڕادبـن دان و کەرەمـە، بەردەوام ئەو مەردینییێ د گەل عاشقێن خۆ دکـەن یێـن ب شـەڤ و ڕۆژ خدمـەتێ بـۆ وان دکـەن، ژ کـورد و عەجـەمان، و ئـەو دەم بـۆ دەمی عشقا خۆ یا زێدە ب نەخشێ خودایی یێ جەببار دخەملینن.

**نـــەقش و نگـــارێ ناقشـــان**
**دیـــوان و صـــەففێ چاوشـــان**
**هەیبـــەی ل جـــۆتێ پادشـــان**
**عـــەجـەب چ ســەرداری دکـــەن**

ئـەو نەخشـێ میـر ل عشـقا خـۆ دکـەن، و وێ پـێ دخـەملینن نـــەخش و نیگارەکـــەکێ عەجێبـــە؛ چـــونکی ئـــەو ب دەســـتێ نەخشکێشێن زیرەک هاتینە کێشـان، و دیـوان و ڕێـزا چاویشـان ژی یا عەجێبە، و وەی بۆ جۆتێ پادشـاهان ژی ئـەو چەنـد سـەردارییەکا عـەجێب ل عاشـقێن خـۆ دکـەن، و چـاوا وان بندەسـتی خـۆ دکـەن و دەسـهەلاتا خـۆ دکـەن. و دیـوان و صـەفێن چاویشـان خـەمل و خێـزا دلبەرێیـە ئـەوا وەکـی چاویشـان حـوکم و دەسـهەلات هـەی، و جـۆتێ پادشاهان ژی کینایەتە ژ هەردو چاڤێن دلبەرێ یێن حوکم و هەیبەتا پادشاهان هەی.

**سەرداریّ شاهیّ رەونەقان**
**موعجز و رەمزیّ ئەهلەقان**
**عەلیوّ مە بیّژە ئەحمەقان**
**بازاریّ ئنکاری دکەن**

بەحسیّ عشقا ویّ دلبەریّ ئەوا سەردار بوّ هەمی شاهیّن خودان بەها و رەونەق و جوانی، و ڕاستیيا وان موعجزەییّن پەردەدرِ و وان رەمز و رازیّن ژ چاڤیّن بەلەکیّن یاریّ دیار دبن، تو -ئەی عەلی- بوّ مروّڤیّن نەزان و ئەحمەق نەبیّژە؛ چونکی ئەو چو ژیّ نزانن، و ئەویّ نەزان بت بازاریّ وی ب تنیّ دیّ ئینکار بت، و ئەو باوەرییّ نائینت.

مەعنا: راز و نهیّنییّن عشقیّ، و حنیّرییّن ئەڤینیّ، دڤیّت بوّ مروّڤیّن نەزان نەئیّنە گوّتن؛ چونکی ئەو د ڕاستییا وان ناگەهن، و ب تنیّ کاریّ وان ئەوە ئینکارا ڕاستییان بکەن.

## شعرا پێنجێ

پەریزادە ب خێر هاتی
ل سەر چاڤێ د من شالان
مە لەو زانی تو وا هاتی
ب دەنگێ طەوق و خرخالان

ژ دەنگێ بازن و زەندا
نەما عەقلێ عەقلمەندا
هندی من گۆت سی و چەندا
تو چێتر بووی ژ هەڤالان

تو چێتر بووی ژ لەیلایێ
شرینتر بووی ژ زولەیخایێ
مەم و زین هەردو یەکتایێ
سیەهـ زولفان کرم تالان

سیا زولفان تو ناترسی
ژ ئەحوالێ مە ناپڕسی
موبارەک بیت تە ئەو کورسی
تو روونی کوهـ عەبدالان

تـو روونـی گوهـ بـده بـەیتێ
ل پێشـی تـو وەکـی زەیتـێ
دسـۆژیت مەجلسـا مـەی تـێ
وەکـی پووشـێ ل کەنـدالان

وەکـی قوقنـوس بـێ پـەروا بـم
دخـۆم سـەد سویند جـودا نـابم
حـەزینم ئـەز قـەط تێـر نـابم
ژ دیـدارا خـەط و خـالان

ل دیـدارا تـە دێ زێـن کـەم
حەتا کـەنگی روحـێ تێن کـەم
کسەر بووم جارەکێ بێن کـەم
خودانـا تیـت و دەسـتمالان

خودانـا تیـت و جەبهـەت بـوو
دیـدارا تـەم ب قسـمەت بـوو
خەراجێ ئەرضـی قیمـەت بـوو
ب خەطـط و خال و ئەشـکالان

ب خەطـط و خال و سـایێ تـو
جهـان جوملـە عـەطایێ تـو
دکێشـم خـاکێ پـایێ تـو
هـەر وەک زێـرێ ب مثقـالان

مـن نـه زێـرم مـن نـه زیڤـم
نـهبوو تێشـتم نـهبوو شـیڤم
ب سـهد هۆیـان کـره کـیڤم
خودانـا دۆشـهک و پـالان

خـودانی تـوم سهراسـهر کـرد
ب زولفـت هـهیڤ سـهتهر کـرد
دلـێ مـن ڤێکـرا بهنـد کـرد
ل عهیـد و جـهژن و سهرسـالان

ئـهول عهیـد و ئـهمانی مـن
عـهزیز و نووجـوانی مـن
دورێ قیمـهت گرانـی مـن
کـهس و کـارێ م بـوون تـالان

ئـهول کـار و کهسـێ مـن تـوی
یـهقین فریادرهسـێ مـن تـوی
کهسـێ مـن و بهسـێ مـن تـوی
ل زێـڕ و مـال و پـهرتالان

ل زێـڕ و مـالی قـازانجم
کـه شـادم صـاحبێ گـهنجم
ل بـازاران گوهـهر سـهنجم
سـهفهر دویـره حـهتا مـالان

سـەفەر دویـرە شـەبێ تـاری
ئـەرێ عـەلیۆ تـو پـڕ ژاری
بکـــە تەوبـــە ب یـــەکجاری
بەلکی ل مە خۆش بت شالان

# پەریزادە ب خێر هاتی

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (هەزەجا هەشتەیی) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییە: (مَفَاعِيْلُنْ مَفَاعِيْلُنْ مَفَاعِيْلُنْ مَفَاعِيْلُنْ)، و مە ئەو ژ دو ژێدەران وەرگرتییە: کتێبا (هۆزانڤانێت کورد) یا سەیدا صادق بەهائەددینێ ئامێدی، و کتێبا (بووژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد) یا سەیدا محەمەد عەلی قەرەداغی، و ژ بەر کو مە چو دەستنڤیسێن ڤێ شعرێ نەدیتینە، و ئەو د ڤان هەردو ژێدەران دا -وەکی هەردو سەیدا ب خۆ دبێژن- یا تژییە ژ کێماسییان، ئەم نەچار بووینە کو ل گەلەک جهان، ل دویڤ سیاقێ شعرێ ئجتهادێ بکەین؛ دا کو شعرێ ب شێوەیەکێ راستتر ل بەرچاڤ بدانین، ب وێ هیڤیێ کو ل رۆژەکێ دەستنڤیسەکا ڤێ شعرێ ب دەست مە بکەڤت، و ئەم بشێین وێ ب رەنگەکێ دورست بخوینین و شرۆڤە بکەین.

د ڤێ شعرێ دا عەلییێ حەریری دڤێت ب مە بدەتە زانین کو دلبەرا وی یا پەریزادە شاها هەمی جوان و دلبەرانە، و ئەو یا هێژایی هندێیە کو هەر تشتەکێ ل عەردی هەی ژ مال و پەرتالی وەک باج و خەراج بێتەدان پێخەمەت مزگینییا هاتنا وێ، و هەر

چەندە ئەو مرۆڤەکێ ژار و دەستڤالایە ژی بەلێ ئەو یێ ئامادەیە کو چی تشتەکێ هەبت بدەت بەرانبەر ب دەستڤە ئینانا دیتن و دیدارا خۆشتڤییا خۆ.

**پەریزادە ب خێر هاتی**
**ل سەر چاڤێ د من شالان**
**مە لەو زانی تو وا هاتی**
**ب دەنگێ طەوق و خرخالان**

پەریزادە، یەعنی: تێشکا پەرییان، بۆ پەری و ئەجنە و فریشتەیان ژی دئێتە گۆتن، و ئەو وەک کینایەت بۆ ژنا جوان دئێتە ب کارئینان، و (شالان) کۆمە و کت (شال)ە، و ل بەر من یا ئاشکەرا نینە کانێ مەخسەدا شاعری ل ڤێرێ ب دورستی پێ چییە؟ ئەگەر ئەو ژ (شالا) کوردی بت کو ئەو شیتکە یا د سەر جلکان ڕا ل ناڤتەنگێ دئێتە شداندن، ئەو د سیاقێ ڤێ مالکێ دا دێ یا بێ مەعنا بت، و ئەگەر ئەو پەیڤەکا عەرەبی بت، دبت ئەو ژ ئێک ژ دو پەیڤان هاتبتە وەرگرتن: ژ (شال، یشیل) یەعنی: ڕادکەت و بلند دکەت، یان دبت ئەو (تەصحیفا) پەیڤا (شەهل) بت، وەکی (چەهڤ) دبتە (چاڤ) و (مەهر) دبتە (مار)، و شەهل ب زمانێ عەرەبی تێکەلبوونا دو ڕەنگانە، و گەلەک جاران ئەو وەکی سالۆخەت بۆ چاڤی دئێتە گۆتن: چاڤێ شەهلا، یەعنی: ئەو چاڤێ هندەک شیناتی یان سۆراتی تێکەلی ڕەشاتییا ڕەشڕەشکا وی بووی، و ئەو ل نک هندەکان نیشانا جوانییا چاڤییە. و

(طـەوق) تـۆكـە، كـو ئـەو تشـتێ گرۆڤرە يـێ ل دۆر تشـتەكێ دی دزڤرِت، وەكی (خرخالێ) يان (خلخالێ) كو ئەز بـازنێ زێرِييـە يـێ ژن بۆ خەملاندنێ دكەنە پيييێن خۆ.

د نيڤا ئێكی ژ مـالكێ دا شـاعر دبێژت: ئـەی دلبـەرا وەكـی پەرييان جوان و خوشـكۆك، تـو ب خێـر هـاتی، ل سـەر چـاڤێن مـن يێن شين.. و بەلكی (شالا) كو د هندەک دانەيان دا وەسا هاتييـە بێی حەرفا (نوونێ) وەكی پەريزادێ گازی بۆ هاتبتە پێشكێشكرن، و (مونادا) بت، و مەخسەد پێ دلبەر بت، يـەعنی: ئـەی پـەريزادە، و ئەی دلبەرا چاڤشين و شەهلا، تـو ب خێـر هـاتی ل سـەر چـاڤێن مـن. يـان: تـو ب خێـر هـاتی و ل سـەر چاڤێن مـن يـا هلگرتـی و بلندكری بی.

پاشی دبێژت: ئەم لەو پێ حەسيايين و مە ب هاتنا تە زانـی؛ چونكی دەنگ و زێرێنا خلخالێن تە هاتە مە بەری كو تو بگـەهييـە نک مە.

**ژ دەنگـــێ بـــازن و زەنـــدا**
**نـــەما عـــەقلێ عەقلمەنـــدا**
**هندی مـن گـۆت سی و چەندا**
**تـو چێتـر بـووی ژ هـەڤالان**

ژ بلی دەنگـێ خلخـالێن تـە، دەنگـێ بـازنێن تـە ژی گـەهشـتـە مـە، ئـەو بـازنێـن تـە كرينە زەندێن خۆ، ئەو دەنگـێ خۆشـێ عـەقل ژ سەرێ عـەقلمەندان بری، و ئـەو شـێت و شـەيدا هـێلاين، و هـنـدی

من گۆتی و مەدحێن تە و جوانیيا تە کرین، سیهـ جاران یان پتر تو چێتر و جوانتر بووی ژ هەمی دۆست و هەڤالان.

د دانەیا (قەرەداغی) دا (هزار چەندان) هاتییە، یەعنی: هزار جاران تو ژ هەمی هەڤالان چێتربووی. و مەخسەدا وی ب هەڤالان ئەو دلبەرێن جوانن یێن کو ناڤ و دەنگێ وان ب جوانییێ بەلاڤبووین، کو ناڤێ هندەک ژ وان د مالکا بێت دا دێ ئێین.

تو چێتر بووی ژ لەیلایێ
شرینتر بووی ژ زولەیخایێ
مەم و زین هەردو یەکتایێ
سیهـ زولفان کرم تالان

ئەی دلبەرا پەریزاد! تو چێتر و جوانتری ژ لەیلایا دلبەرا مەجنوونی، و تو شرینتری ژ زولەیخایێ ژی ژنا عەزیزێ مصرێ یا کو ل یووسفی عاشقبووی، و مەم و زین هەردو ژی پێکڤە نائێنە ڕێزا تە.. و زولفێن تە یێن ڕەش ب جوانییا خۆ یا زێدە ئەز تالان کرم.

سیا زولفان تو ناترسی
ژ ئەحوالێ مە ناپرسی
موبارەک بیت تە ئەو کورسی
تو روونی گوهـ عەبدالان

ئەرێ ما تو ژ خودێ ناترسی تە ب زولفا خۆ یا ڕەش ئەز تالان کرم؟! و جارەکێ تو پسیارا حالێ مە ناکەی؟ ڕاستە تو ل سەر کورسییا شاهاتییێ یا ڕوینشتی، و دەسهەلاتا تە ل سەر هەمی پەرییان هەیە، بەلێ پا هیڤییا مە ژ تە ئەوە دەمێ تو ل سەر وێ کورسییێ دڕوینییە خوارێ تو مە عەبدالان ژ بیر نەکە، و گوهدارییا گللە و گازندەیێن مە بکە.

**تو روونی گوهـ بدە بەیتێ**
**ل پێشی تو وەکی زەیتێ**
**دسۆژیت مەجلسا مەی تێ**
**وەکی پووشێ ل کەندالان**

ئەگەر تو ل سەر کورسییا دەسهەلاتا خۆ ڕوینشتی، تو گوهدارییا ڤان بەیتان بکە یێن ئەم ب تە و بۆ تە ڤەدهینین، و بزانە کو ئەو مەجلسا ل پێشییا تە هەی، و ژ بەر ڕۆناهییا روییێ تە یێ گەش هەر تشتەکێ هەبت وەکی وی پویشێ ل کەندالان ب زەیتێ دئێتە سۆتن. و گۆت: پویشێ ل کەندالان؛ چونکی ئەو یێ بەرهەوایە و ئاگر زویتر ڤێڕا دچت و هەمییێ دسوژت.

**وەکی قوقنوس بێ پەروا بم**
**دخۆم سەد سویند جودا نابم**
**حەزینم ئەز قەط تێر نابم**
**ژ دیدارا خەط و خالان**

(قوقنوس) د بنيات دا پەيڤەكا يۆنانييە، ناڤێ طەيرەكێ ئەفسانەييیە، دبێژن: ئەو ل دۆر ئاگری دزڤرِت و خۆ دهاڤێته ناڤ و پێ دئێته سۆتن، پاشی طەيرەكێ دی یێ وەكی وی ژ خولییا وی چێ دبت، و ئەو ژی وەكی یێ بەری خۆ دكەت.

شاعر دبێژت: ئەگەر ئەز وەكی طەیرێ قوقنوسی بێ پەروا بم، یەعنی: موجازەفێ بكەم و بێ ترس و خەم خۆ بهاڤێمە ناڤ وی ئاگرێ تو ب رِۆناهییا دێمێ خۆ بەرددەیە مەجلسا خۆ، ئەز سەد سويندان دخۆم كو ئەز ژ وێ مەجلسێ و وی ئاگری ڤەدەر و جودا نابم، ئەگەر چەند ئەز بێمە سۆتن ژی، و ئەزێ خەمگین وكی طەیرێ قوقنوسی ژ سۆتنا ب ئاگرێ تە قەت تێر نابم، ئەگەر ئەز بێمە سۆتن ئێكێ دی یێ وەكی من دێ ژ خولییا من چێ بت، ئەو ژی دێ حەز ژ تە كەت و خۆ ب ئاگرێ تە سوژت، و ئەز قەت ژ دیدار و دیتنا خەت و خالێن دێمێ تە تێر نابم.

ل دیدارا تە دێ زێن کەم
حەتا کەنگی روحێ تێن کەم
کەسەر بووم جارەکێ بێن کەم
خودانا تیت و دەستمالان

مەعنایا (زین) یان (زێن) د ڤێ مالكێ دا ل بەر من یا روهن نینە، د دانەیا (قەرەداغی) دا (حەزین کەم) هاتییە، و (تیت) رِەنگەكێ بەربسكان بوو ژنان خۆ پێ دخەملاند، د دانەیا (قەرەداغی) دا ل شوینێ (چیت) هاتییە، و چیت پەرِۆكەكە

ژ پـەنـپـی دئـێـتـە دورستکرن ژنان وەکی عـەبا ب سـەر جلکـان دا ب کاردئینا ، و (دەستمال) دەرسۆکە.

یەعنی: حـەتا کـەنگی ئـەز دێ ل هیڤییـا دیدارا تـە خـەمگین مینم، و رحا من تێنییا دیتنا تە بت؟ خەم و کەسەرا مـن ئـەو بـوو جـارەکـێ ئـەز خـودانـا تـیـت و دەسـتمالان ببینم و بێنا وێ سـەح بکەم.

**خودانـا تیـت و جەبهـەت بـوو**
**دیـدارا تـەم ب قسـمەت بـوو**
**خـەراجێ ئەرضـی قیمـەت بـوو**
**ب خـەطـط و خال و ئەشـکالان**

ئەو دلبەرا من کەسەر کو جارەکێ ببینم و بێن بکـەم، خودانـا تـیـت و ئـەنـیـیـا کەڤەر بوو، ڤێجا ئەی دلبەر ئەگـەر جارەکێ دیـدار و دیتنا تە بۆ من ببا قسـمەت، ئـەز خـەراجێ عـەری هـەمیێ وەک قـیمـەت و بهایێ وێ دیدارێ دا دەم، بەرانبەر هندێ کو ئـەز خـەط و خال و شکلێ تە ببینم.

**ب خـەطـط و خال و سایێ تـو**
**جهـان جوملـە عـەطایێ تــو**
**دکێشــم خـــاکێ پـــایێ تـــو**
**هـەر وەک زێـرێ ب مثقـالان**

جیهـان پێکڤـە، ب هـەمی ملکـەتێ وێ ڤـە ب بـەر هنـدێ دکەڤت وەک باج و خەراج بێتەدان وەک بها بـۆ دیتنـا خـەط و خال

و سیبەرا خەمل و گوهارێن تە، هندی هند تول بەر دلێ من یا ب بهایی، و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ئەو ئاخا تو پییێ خۆ ددانییە سەر و پێ لێ ددانی، ئەز وەکی زێڕی ب میسقالان دکێشم و بها دکەم.. چونکی ئەو ئاخ بۆ برینێن دلێ من دەرمانە، و بۆ چاڤێن من بیناهی و کلە!

**من نە زێڕم من نە زیڤم**
**نەبوو تێشتم نەبوو شیڤم**
**ب سەد هۆیان کرە کیڤم**
**خودانا دۆشەک و پالان**

هەر چەندە تو هێژایی هندێ یی جیهان هەمی وەک بها بۆ دیدارا تە بێتەدان ژی، بەلێ پا نە من زێڕ هەیە و نە زیڤ کو ئەز بدەم، و نە من تێشت هەیە و نە شیڤ، مەعنا: ئەز مرۆڤەکێ ژار و دەستکورتم، و خودانا دۆشەک و بالگەهان ئەز ب سەد ئاهـ و هۆیان دەربدەر و کیڤی کرم. مەعنایا (هۆیان) ب دورستی من نەزانییە، بەلێ ئەو ل نک صووفییان ڕەنگەکێ زکرییە ژ (هو) یا عەرەبی هاتییە کو ئیشارەتە بۆ خودێ، و (های و هۆی) ژی هەیە ڕامانا دەنگێ بلند و گرییێ ددەت.

**خودانی توم سەراسەر کرد**
**ب زولفت هەیڤ سەتەر کرد**
**دلێ من ڤێکرا بەند کرد**
**ل عەید و جەژن و سەرسالان**

ئەڤ مالکە گەلەک یا رێک و پێک نینە، و بەلکی مەعنایا وێ ئەڤە بت: سەراسەر تویی خودان بۆ من، تە ب زولفا خۆ یا ڕەش هەیڤا گەش ڤەشارتییە، و هەیڤا ڕەش ئستیعارەیە بۆ دێمێ وێ، و ل عەید و جەژن و سەرسالان تە دلێ من ڤێکرا ب وێ زولفا خۆ یا ڕەش کرە بەند و ئێخسیر.

**ئەول عەید و ئەمانی من**

**عەزیز و نووجوانی من**

**دورێ قیمەت گرانی من**

**کەس و کارێ م بوون تالان**

ئێکەمین جەژن و تەناهی و خۆشی بۆ من تویی، تو عەزیز و نووجوانا منی، و دورا ب قیمەت و بهاگرانا من تویی، تە ب جوانییا خۆ ئەز ب کەس و کار ڤە تالانکرم.

**ئەول کار و کەسێ من توی**

**یەڤین فریادرەسێ من توی**

**کەسێ من و بەسێ من توی**

**ل زێڕ و مال و پەرتالان**

ئێکەمین کەس و کارێ من تویی، و بێ گومان تویی د هەوارا من دئێی و من ڕزگار دکەی، و من ژ ناڤبەرا هەمی کەس و کار و و زێڕ و مال و پەرتالێن دنیایێ من تو بەسی، و ژ تە پێڤەتر من هەوجەیی ب کەسی دی نینە.

ل زێـــڕ و مـــالی قـــازانجم
کــه شـادم صـاحبێ گـه‌نجم
ل بـــازاران گوهـــه‌ر ســـه‌نجم
ســه‌فه‌ر دویــره حــه‌تا مــالان

ئه‌گه‌ر مه تو هه‌بی ئه‌ز یێ سه‌رفایده و قازانجم و خودان زێڕ و مالم، ئه‌گه‌ر چ ده‌ستێ من ژ مالێ دنیایێ یێ ڤالا ژی بت، و ئـه‌ز یـێ دلشـاد و که‌یفخۆشم و خـودان گه‌نـج و خزینه‌مـه، و ئـه‌ز ل بازاران گه‌وهه‌ران دکێشم و دپیڤم، یه‌عنی: ئه‌ز یێ ده‌وله‌مه‌ندم.. هه‌ر چه‌نده سه‌فه‌را من حه‌تا کو ئه‌ز دگه‌هه‌مه جهـ و مـالان یـا دویـره ژی.

ل شـوینـا (کـه شادم) د بنیـات دا (که‌سادم) هاتییـه، بـه‌لێ ب هزرا من ئه‌و خه‌له‌تییا نقیسینێیه، و (صاحبێ گه‌نجم) د دانه‌یا قـه‌ره‌داغـی دا (صـاحبـێ ڕه‌نجم) هاتییه، و ل شـوینا (ل بـازاران) ل نک ئامێدی (ل بازێرا) هاتییه.

و مه‌خسـه‌دا وی ب مـالان مـالێن ئاخره‌تێیـه و سـه‌فه‌ر مرنـه، وه‌کی ژ مالکا بێت دێ بۆ مه دیار بت.

ســه‌فه‌ر دویــره شــه‌بێ تــاری
ئــه‌رێ عــه‌لیۆ تــو پــڕ ژاری
بکـــه تـه‌وبـــه ب یـــه‌کجاری
به‌لکی ل مه خۆش بت شالان

ئەو وەغەرا ل بەرا تە هەی -ئەی عەلیۆ!- وەغەرەکا دویر و درێژە، و شەڤا تارییە، و تو مرۆڤەکێ ژاری، چانتکێ تە یێ ڤالایە ژ زادی و تە تشتەک نینە د گەل خۆ ببەی، ڤێجا تو ب ئێکجاری ژ گونەهێن خۆ تۆبە بکە، بەلکی مەحبووبێ بلند ل مە خۆش ببت و ژ مە رازی ببت.

د دانەیا قەرەداغی دا هاتییە: (بەلکو ڕزگار ببی شالان).

## شعرا شەشێ

دیسـان ژ نـوو عشـقا بـەرێ
پـورڕ ئەندەروونـەم ئاتەشـە
زولفـا موزەییـەن عەنبـەرێ
دەعـوا د گـەل خـالا ڕەشـە

خـالا ل دیمـی دل ڕەڤـا
سـەد روح و جـانم بـن فـدا
سـۆتم گـەلۆ چـوم تـێ نـەما
تـەرکم کـرن عـەقل و هەشـە

عـەقل و هەشـم بوونـە ئەسـیر
دینـا کـو کەهـ کەهـ تێتـە بیـر
دێـم شـوبهەتی بـەدرا مـونیر
زولفـا ژ وەردێ بێنخوەشـە

وەردان ژ نیـڤ زولفـا دەریـن
شـوعلا بنەفشـێ تـێ وەریـن
بـالا و قـەددا عەرعـەرین
هژیـان ل سـەر مـارێ ڕەشـە

هژیـــان ل ســـەر مـــارێ د ڕەش
وەردێ د ســـۆر وەردێ دگـــەش
سووســن و سـونبول هـەم بنـەفش
هـەر جـا کـو دیتـی لـێ مەشـە

هـەرجا کـو حـەی تێـت و دچیت
ئحیـــائێ ئـــەمواتان دبیـــت
وەجهـان مـودام نـوور ژێ دچیت
دێـم شـوبهەتی شـەمعا گەشـە

شـــەمعا شەبســـتانان ئـــەوە
وەردا گولســـــتانان ئـــــەوە
ســـەروا د بوســـتانان ئـــەوە
شـــۆخا حـــەریری دلگەشـــە

عـــەجیب لـــەطیف و جندییـــە
ئـــەزمان نـــەزان و ڕۆمییـــە
ئاگەهـــ ژ عشـــقبازان نییـــە
مەســت و خومــار و سەرخوەشـە

سەرخوەشـــێ جامــا شـــەربەتێ
دێـم شـوبهی شـەمعا ظـولمـەتێ
حووریـــا ت بـــاغێ جەننـــەتێ
ســـەرداری چەنـــدین مەهوەشـــە

مەهوەش کو وەستان صەف ب صەف
ئــەو هاتــەدەر مصــری ت کــەف
وان گۆت: عـەلییۆ (لا تەخـەف)
مــە ب مردنــێ قــەوی خوەشــە

## دیسان ژ نوو عشقا بەرێ

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (رەجەزا هەشتەیی) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییە: (مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ)، و مە ئەو ژ چار دەستنڤیسان وەرگرتییە: دانەیا موحەممەدێ کورێ مەسیحایی، و یا شێخ ئەحمەدێ فەقیرێ گوندشێخی، و یا سەیید ئیبراهیمێ بێسکی، و یا مەلا مصطەفایێ یووسفی. و مژارا سەرەکی یا شعرێ ل دۆر وێ عشقێیە یا ژ بەرێ وەرە و د کەڤن دا بوویە بار و نەصیبێ شاعری، و جارەکا دی ئاگر د هناڤ و دەروونێ وی دا پەیدا کری، هەر وەسا شاعر سالۆخەتێ دلبەرا خۆ ژی بۆ مە ڤەگێرت، ئەوا ب جوانییا خۆ یا زێدە ئاگرێ ئەڤینێ یێ دژوار بەردایە دلێ وی.

**دیسان ژ نوو عشقا بەرێ**
**پوڕ ئەندەروونەم ئاتەشە**
**زولفا موزەییەن عەنبەرێ**
**دەعوا د گەل خالا ڕەشە**

دیسا ژ نوی و جارەکا دی، ژ بەر وێ عشقا ژ بەرێ وەرە و د کەڤن دا بۆ مە بوویە بار و نەصیب، دل و هناڤێن من ژ ئاگرەکێ ڤینێ یێ دژوار و سوژەک یێ تژییە، ئەو ئاگرێ هێشتا پتر ل من دژوار دبت گاڤا ئەز وان زولفێن دلبەرێ دبینم، یێن کو ژ ڕەنگ و بێنا عەنبەرێ هاتینە خەملاندن. ئەو زولفێن هەڤڕکی و دەعوایێ د گەل خال و نیشانا وێ یا ڕەش دکەن، و هەر ئێک دبێژتە یا دی: ئەز ژ تە ڕەشتر و بێنخۆشترم!

د دانەیا (گوندشێخی) دا (بەرین) و (عەنبەرین) ل شوینا (بەرێ) و (عەنبەرێ) هاتییە، و ئەو چوینێ ژ مەعنایێ ناگوهۆڕت. هەر وەسا د دانەیا (محەمەدێ کوڕێ مەسیحایی) دا (ت گەل) ل شوینا (د گەل) هاتییە، و ئاشکەرایە کو د لەهجەیا هەکارییان دا هندەک جاران (ت) جهێ (د) دگرت.

**خالا ل دێمی دل ڕەڤا**
**سەد روح و جانم بن فدا**
**سۆتم گەلۆ چوم تێ نەما**
**تەرکم کرن عەقل و هەشە**

نیشانا ڕەش و بێهنخۆشا دێمێ دلبەرێ، یا کو زولفا وێ یا عەنبەری دەعوایێ د گەل دکەت -وەکی د مالکا بۆری دا هاتی- ب جوانییا خۆ یا زێدە دلێ مە ڕەڤاند و ژ سنگێ مە ئینادەر، و تشتەکێ حنێر نینە ئەم دلێ خۆ بدەینێ؛ چونکی ئەگەر سەد رح و جان ژی مە هەبان ئەم دا گۆری کەین و دەینێ! و گەلی دۆست

و هەڤالان، ژ بەر عشق و ئەڤینا ڤێ دلبەرێ، ئەز فەنابووم و چو د من نەما، حەتا وێ دەرەجێ عەقل و هشێن خۆ ژی من ژ دەست دا، و ئەز وەکی مرۆڤەکێ دین و هار لێ هاتم.

د دانەیا (گوندشێخی و بێسکی) دا (دلروبا) ل شوینا (دل رەڤا) هاتییە، و هنگی مەعنا ب ڤی رەنگی لێ دئێت: ئەو نیشانا ل سەر روییێ دلبەرا دلرەڤین هەی سەد رح و جانێن من بۆ بینە گۆری.

**عەقل و هەشم بوونە ئەسیر**
**دینا کو کەھ کەھ تێتە بیر**
**دێم شوبهەتی بەدرا مونیر**
**زولفا ژ وەردێ بێنخوەشە**

گاڤ بۆ گاڤێ دەمێ دیتنا وێ ل بیرا من دئێتە ڤە، ئەو عەقل و هشێن من ژ من دستینت و دکەتە ئێخسیر. مەعنا: نە ب تنێ ئەز ب دیتنا وێ دین و سەودا دبم، بەلکی خۆ دەمێ ئەز دیتنا وێ ژی جار جار ل بیرا خۆ دئینم، خۆ ئەگەر ئەو ل بەر چاڤێن من نەبت ژی، ئەز دین و سەوداسەر لێ دئێم! ئەو دلبەرا دێمێ وێ وەکی هەیڤا چاردەشەڤی یا گەش، و بێنا بسک و زولفا وێ ژ بێنا گولێن بێنخۆش هاتییە وەرگرتن.

د دانەیێن (گوندشێخی، و بێسکی، و یووسفی) دا ل شوینا (دینا) پەیڤا (دنیا) هاتییە، و ب راستی من چو مەعنا بۆ نەزانینە، و دویر نینە ئەو دەستتێڤەدان بت.

**وەردان ژ نیڤ زولفا دەرین**
**شوعلا بنەفشێ تێ وەرین**
**بالا و قەددا عەرعەرین**
**هژیان ل سەر مارێ ڕەشە**

(وەرد) یەعنی: گول، ل ڤێرێ ئستیعارەیە بۆ دێمی ئەوێ وەکی گولێ جوان و تەڕ و گەش، و گۆتن ل ڤێرێ بۆ دلبەرێیە، شاعرێ عاشق دبێژتێ: تو دێم و ڕوییێ خۆ یێ گەش وەکی گولان ژ ناڤ زولفێن خۆ یێن عەنبەری و بێنا گولان ژێ دئێت دەربێخە و نیشا مە بدە، و گەشاتییا بنەفشێ تێ بوەرینە، و بەلکی مەخسەدا وی ئەو بت ڕەنگێ مۆرێ بنەفشی تێ بدە و ل سەر بدانە، و بەژن و بالایا ڕاست و زراف، یا وەکی دارا عەرعەرێ کو جوینەکێ کاژانە، مارێ ڕەش پێدا هاتە خوار و ل سەر هژیان، و مارێ ڕەش ل ڤێرێ ئستیعارەیە بۆ کەزییێ.

د دانەیا (گوندشێخی) دا: (شۆرا بنەفشێ پێ وەرین) هاتییە، و بەلکی (شۆرا بنەفشی) ژ ڕەنگێ پالدانا صیفەتی بۆ مەوصووفی بت، یەعنی: بنەفشا شۆر پێدا بینە خوارێ، و هنگی مەخسەد ب بنەفشێ دێ پەرچەم یان ئەو ڕیشیک بن یێن دلبەر ل ئەنییا خۆ دشدینت، مەعنا: پەرچەم یان ڕیشیکێن بنەفشی ب سەر دێمێ خۆ دا بینە خوارێ.

**هژیان ل سەر مارێ د ڕەش**
**وەردێ د سۆر وەردێ دگەش**

**سووسـن و سـونبول هـەم بنـەفش**
**هـەر جـا كـو ديتـى لـێ مەشـە**

ل سەر وێ بەژن و بالايا وەكى دارا عەرعەرێ ڕاست و زراڤ مـارێن ڕەش، كـو كەزينـە، ل سـەر هژيـان، و سووسـن و سـونبول و بنەفش ژى هەر جارەكا گولا سۆر و گەشا دێمى دبينن لێ دخشـيێن و ب سەر دا دئێنە خوارێ.

ئەڤ مالكە ب تنێ د دانەيا (گوندشێخى) دا هەيە، و ئـەو د هەر سێ ژێدەرێن دى دا نەهاتييە.

**هـەرجا كـو حـەى تێـت و دچيـت**
**ئحيـــائێ ئـــەمواتان دبيـــت**
**وەجهـان مـودام نـوور ژێ دچيـت**
**دێـم شـوبهەتى شـەمعا گەشـە**

(حەى) مارە ب زمانێ عـەرەبى، و ئـەو ل ڤێـرێ ئسـتيعارەيە بۆ كەزييێ، دبێژت: هەر جارەكا كەزييا وێ يا وەكى مارى ب سـەر بـەژنێ دا دئێـت و دچـت، مـرى پـێ زێنـدى دبـن، و د دانـەيا (گوندشێخى) دا (ئەرواحان) ل شوينا (ئەمواتان) هاتييە، يـەعنى: رح پێ زێندى دبن، و دێم و ڕوييێن وێ هەردەم ڕۆناهى ژێ دچت، و دێمـێ وێ د گەشـاتى و زەلالييـا خـۆ دا وەكـى چرايـێ هـەردەم گەشە.

د دانـەيا (مەسـيحايى و بێسـكى) دا: (ديسـان) ل شـوينا (هەرجا ) هاتييە، و مەعنا گەلەک يا جودا نينە.

**شــــەمعا شەبســــتانان ئـــــەوە**
**وەردا گولســـــــتانان ئـــــــەوە**
**ســـــەروا د بوســــتانان ئـــــەوە**
**شـــــۆخا حـــــەریری دلگەشـــــە**

شەمال و چرایێ شەڤێن تاری ئەوە، و گولا گەشا گولستانان ئەوە، و دارا سەرۆیێ یا بەژن زراف و بلندا ل ناڤ باغ و بیسانان ئەوە، و ئەوە شۆخا حەریری یا دلگەش.

ئەڤ مالکە د دانەیا (گوندشێخی) دا ب ڤی ڕەنگی هاتییە:

شـەمعا ژ بوسـتانان ئـەوە ســـەروا ژ بوســـتانان ئـــەوە
وەردا گولســـــتانان ئـــەوە مەست و خومار و سەرخوەشە

ئاشکەرایە کو ل ڤێرێ ناسناڤێ شاعری نەهاتییە. و د دانـەیا (بێسکی) دا دووماهییا مالکێ ب ڤی ڕەنگییە: (شۆخ و حەریرا دلگەشـە) یـەعنی: شـۆخ و شـەنگا نـازک و ب بهـا یـا وەکـی ئاڤرمیشـی ئـەوە.. و ب ڤـی ڕەنگـی (حـەریر) نابتـە ناسـناڤێ شاعری.

**عـــەجیب لـــەطیف و جندییـــە**
**ئـــەزمان نـــەزان و رۆمییـــە**
**ئاگەهـــ ژ عشـــقبازان نییـــە**
**مەســـت و خومـــار و سەرخوەشـــە**

دلبـەرەکا زێدە نـازک و جوانـە، رۆمییـەکا نەزانـە ب ئـەزمانێ مـە! و د دانـەیا بێسـکی دا هاتییـە: (ئـەزمان و زارێـت رۆمییـە) یەعنـی: ئـەو ب ئـەزمـان و زارێ خـۆ یـا رۆمییـە، لـەو د گـۆتـن و هیڤییێن مـە عـاشقان نـاگـەهـت، و یـا بێ ئاگەهە ژ حالێ مـە، و ئەو دەمێ ئەو ب رێڤە دچت ئەو وەسا خۆ دهژێنت دێ بێژی ئـەو مەستەکا سەخۆشە.

ئەڤ مالکە د دانەیا (گوندشێخی) دا نەهاتییە.

**سەرخوەشـێ جامـا شـەربەتێ**

**دێـم شـوبهی شـەمعا ظـولـمـەتێ**

**حووریـا ت بـاغێ جەننـەتێ**

**سـەرداریّ چەنـدین مەهوەشـە**

ئەو دلبەر مەست و سەرخۆشا جاما شەربەتێیە، لـەو د چوونـا خۆ دا ئەو وەسا دهژییێت، و دێمێ وێ وەکی وی چرایە یێ تـارییێ ڤـەدرەڤینت، ئـەو حووریـیـە د نـاڤ بـاغێ بەحەشـتێ دا، و سـەردارا چەندین (خۆشتڤییانە یێن دێمێ وان وەکی مەهێ دگەش و روهن.

**مەهوەش کو وەستان صف ب صف**

**ئـەو هاتـەدەر مصـری ت کـف**

**وان گـۆت: عـەلـییۆ (لا تـخـف)**

**مـە ب مردنـێ قـەوی خوەشـە**

دەمێ خۆشتڤییێن وەکی مەهێ دگەش هاتینە بەزما ئەڤینێ و ئەو هەمی پێکڤە رێز رێز راوەستیاین، دلبـەرا مـە سـەردارا هـەمی

مـەهـوەشـان د نـاڤ وان دا هـاتـەدەر، و شـيـرێ وێ يـێ مصری د دەستی دا بوو، هەر وەكی ئارمانجا وێ ئەو بوو مە پێ بكـوژت. و بـەلكی شيرێ مصری ل ڤێـرێ ئستيعارە بت بـۆ ئـاورێن چاڤـان يێن دژوار و كـوژەک، و دەمـێ ئـەو ب ڤـی تـەرزی دەركـەفتی، وان مەهوەشان گۆتە من: عەلييۆ! تو خۆ دربـێن وێ نەترسینە، بـلا ئـەو دربێن خـۆ بدانـتـە تـە؛ چونكی مـە -تـوخمێ عاشقان- گەلـەک پـێ خۆشە كو ب دربێن چاڤێن خۆشتڤييان بمرين، و د رێكـا وان دا و ب دەستێن وان شەهيد ببين. نيڤـا دويـێ ژ ڤـێ مـالكێ د هندەک دانەيان دا ب ڤی رەنگییە:

گـوهتی حوسـەینی لا تەخـەف مەقتووليیا تە ب ڤێ خوەشـە

يـەعنی: گاڤـا دلبـەرێ ديتـی ئـەم ژ دربـێن وێ ترسـياين، وێ گۆتە مە: ئەی (حوسەينی) تو نەترسـە؛ چـونكی كوشتنا تـە ب ڤـێ دربـا كـو ب شـيرێ مـە دبـت تشـتـەكێ خۆشـە بـۆ تـە. و بـەلكی مەخسەد ب پەيڤا (خۆش) ل ڤێرێ ژيـان بـت، يـەعنی: كوشـتنا تـە دەمـێ ب دربێن مـە دبـت، ئـەو بـۆ تـە ژيانـا ب دورسـتييە نـە كـو مرنە.

و ژ ڤـێ ريـوايـەتـێ دئێتە وەرگرتن كـو شێخ عـەلـييێ حـەريری ژ مالباتەكا سەييدان بـوو يـێـن كو نەسەبا خۆ بـۆ ئيمـامێ حوسـەين -خودێ ژێ رازی بت- دزڤرينن، لەو وی ناسناڤێ حوسـەينی بـۆ خـۆ دانايە.

## شعرا حەفتێ

خـــــــەلقۆ وەرن ببيـــــــنن
چ حوســـــــنەكە ل كەمالـــــــە
حـــــــەيران ژ دل بميـــــــنن
ل صـــــــونعا ذولجەلالـــــــە

صـــــونعا خـــــودێ وە دايـــــى
صـــــەفحە ژ نـــــوورێ داينـــــايى
عەنبـــــەر ل ســـــەر كێشـــــايى
ئـــــەبروو و خـــــەط و خالـــــە

خاليـــــت شـــــوبهى عەنبـــــەرێ
ديـــــم هـــــەر وەكـــــى قەمـــــەرێ
ئـــــەز تێـــــر نـــــابم ژ نەظـــــەرێ
مـــــن قـــــەط ناچيـــــت ژ خيالـــــە

مـــــن قـــــەط ناچيـــــت ژ بيـــــرە
زولفێـــــت شـــــوبهەت حـــــەريرە
ل ســـــەر بـــــەدرا مـــــونيرە
داگرتبـــــــــوون هلالـــــــــە

ئـــەبروو هـــلالا عيـــدێ
ئەبلـــەق شـــوبهی ناهيـــدێ
دێـــم هـــەر وەكـــی خورشـــيدێ
جەبهـــەت مـــەها ل كەمالـــە

جەبهـــەت مـــەها تەڤاڤـــە
ڕوو ســـــۆرگولا ب خوناڤـــە
ڕەيحـــان هاتنـــە هنداڤـــە
نەســـرينان دا ڤـــێ پالـــە

نەســـرينان جۆقـــەت بەســـتە
مـــن نێڕايـــێ ب هەوەســـتە
عـــەقلێ مـــن چـــوو ژ دەســـتە
حـــەيران كـــرم دەر حالـــە

حـــەيران بـــووم ئـــەز ل دينـــێ
ســـــۆتم دەردێ ئـــــەڤينێ
ژ خـــۆ ناكـــەم هيڤيـــا ژينـــێ
ل مـــن كێمبـــوون مەهــ و ساله

موصـــحەفا خـــەطط و خـــالان
مـــــــەتنێ ژ لام و دالان
ژ بـــەر زەحمـــەت ئەشـــكالان
كـــەس ناكـــەتن مطالـــە

ژ چاڤـان مــن خــوون ت بـاری
ژ دەســت ئەبلــەقێت خومــاری
وەکـــی ئاڤێـــت ت جـــاری
بـــێ وەقـــت و بـــێ مەجالــە

وەصـــــفێت ت نازەنینـــان
مـــەدحێت ت سورشـــرینان
وەکـــی دوڕڕ و یاســـمینان
ت بێـــژم ئـــەز عەمالـــە

گـــەردەن شیشـــا نـــەباتێ
لێـــڤ شـــەربەتا حـــەیاتێ
ئـــەز پـــێ ت بینـم نـــەجاتێ
ژ دەردێ پـــــوڕ مەلالـــــە

لێڤێـــت شـــوبهی نـــەباتێ
ئـــەز نـــادەم ب حـــەیاتێ
ژ حوســـنا بـــوت و لاتـــێ
ب مـــن جاهــــ و جەلالـــە

حوســـنا تـــە یـــا حەبیبـــە
دلـــێ مـــن ژێ غەریبـــە
یەللاهــ تـــو بکـەی نەصـــیبە
دەســـت بـــدەتن وصـــالە

حوسنا ته یا دلخواهه
ت بەر لبسێ سیاهه
ب مەن کەعبەتوللاهه
طەواف بکەم هەر ساله

باغێ کو هەر بوهار لێ
سونبول و لالەزار لێ
چەند کولیلکێت ب خال لێ
بولبولی نالەناله

دیمێ خالێت د هوور لێ
ئەنیا زولفێت شوتوور لێ
رەونەقا کۆهێ طوور لێ
مەحبوویه بێ میثاله

مەحبوویه بێ هەمتایه
قامەت سەلوا بالایه
گیسۆ شەڤا یەلدایه
گەردەن ب خۆ شەماله

گەردەن شەمعا کافووری
پەرده ل سەر ژ نووری
رەونەقێ دا ڤ طووری
تەجەللا کر جەماله

تەجەللا كريوو جارەک
حوسنا خۆ يا مويارەک
(أحسن الله تبارک)
چ شەمسە بێ زەوالە
زولفێت شەهلەوەندان
بسكێت مەحبووب و رەندان
ئێخستمە قەيد و بەندان
بەردانەڤە مەحالە
چاڤێت شۆخ و شەنگان
غەمزێت دل فڕەنگان
دل دا ڤ بەر غەدەنگان
خوون ڤەخوارن حەلالە
مەحبووبا دلنەوازان
بلندا سەرفرازان
عالەم ڤڕكر ب نازان
ڤەت نابێژيت وەبالە
ژ مصرێ بينن خەراجێ
ژ هندێ بكەن تاراجێ
ژ رۆمێ بستينن باجێ
ژ بۆ خەملا يا دەلالە

ژ هنـــدێ بیـــنن تـــالانێ
بکـــڕن کلـــێ ســـوبحانێ
ژ بـۆ چـەهڤێت شەهـ سولطـانێ
دەمـــا تێـــتن سەرســـالە
چەنــد بێــژی عــەلیێ صــادق
ژ ئەســـرار و دەقـــائق
ئـــەڤان وەصـــفێت لائـــق
ژ حوســـنا یـــا دەلالـــە

# خەلقۆ وەرن ببینن

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (رەجەزا مەخبوون و مەقطووع) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییە: (مُسْتَفْعِلُنْ فَعُوْلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ فَعُوْلُنْ).

ئەڤ شعرە د چار ژێدەرێن دەستنڤیس دا ب بەر چاڤێن مە کەفتییە، دەستنڤیسا کەڤنتر ئەوە یا ب دەستێ موحەممەدێ کورێ مەسیحایی هاتییە نڤیسین، و وی ئەڤ شعرە بۆ صادقی پالدایە، بێی ئاشکەرا بکەت کانێ صادق کییە، بەلێ د کەشکۆل و دەستنڤیسا دیوانا مەلایێ جزیری دا -کو ژێدەرێ مە یێ دوییێیە یێ ڤێ شعرێ- ئەڤ شعرە د گەل دو شعرێن دی ژی یێن صادقی ب فارسی هەنە نڤیسەری ل بەراهییا شعرەکێ نڤیسییە: (هذا من کتاب دیوان صادق عمادی) و ژ ڤێ گۆتنێ دئێتە زانین کو شاعرەکێ ئامێدی هەبوو ناڤ یان ناسناڤێ خۆ یێ شعری کربوو صادق[1].

---

(١) د کتێبا خۆ (باغێ ئیرەم) دا، بپ ٦٦، مە بەحسێ ڤی شاعری کرییە.

ژێدەرێ سییێ دەستنڤیسەکا کەڤنە کۆمەکا شعرێن کرمانجی تێدا هەنە، و ئێک ژ وان ئەڤ شعرەیە بەلێ نڤیسەری ل پێشییێ نڤیسییە: (عەلی حەریری فرمایـد)، هەر وەسا ئەڤ شعرە د دەستنڤیسا (مجمع القصائد) یا سەیدا مەلا زینەلعابدینێ ئامەدی ژی دا هاتییە، و وی ئەو بۆ حەریری پالدایە.

ژ ڤێ چەندێ دئێتە زانین کو ئەڤ شعرە بۆ عەلییێ حەریری و صادقێ ئامێدی هەردویان دئێتە پالدان، هەر چەندە ئحتمالا سێیێ ژی هەیە ئەو ژی ئەڤەیە کو حەریری و صادق هەردو ئێک کەس بن، و (صادق) ناسناڤێ حەریری یێ شعری بت؛ چونکی دووماهییا شعرێ د دانەیەکێ دا ب ڤی ڕەنگییە:

چەنـد بێـژە عـەلییێ صـادق
ژ ئەسـرار و دەقـائق
ئـەڤان وەصـفێت لائـق
ژ حوسـنا یـا دەلالـە

بەلێ ب ڕاستی ڤێ مەسەلێ -وەکی مە ل پێشییا ڤێ کتێبی ژی گۆتی- هێشتا دویڤچوون و ڤەکۆلین پێ دڤێت.

ل ڤێرێ ئەم دێ ڤێ شعرێ ژی ب شەرح ڤە ل بەر دەستێ خواندەڤان دانین بێی کو پالدانا وێ بۆ عەلییێ حەریری مسۆگەر بکەین، حەتا ڕۆژەک دئێت و ئەڤ مەسەلە پتر ل بەر مە زەلال دبت.

مژارا سەرەکی یا ڤێ شعرێ ل دۆر سالۆخدانا جوانییا دلبەرێیە ب تایبەتی دێمێ وێ، هەر وەسا شاعر بەحسێ حالێ خۆ بۆ مە دکەت یێ کو ئەو ژ بەر عشقێ کەفتییێ، و دەمێ مرۆڤ ڤێ شعرێ دخوینت، هەست پێ دکەت کو شێوەیێ ڤێ شعرێ گەلەک ب سەر شعرێن دی یێن حەریری ڤە دچت.

ل دەسپێکێ شاعر داخوازێ ژ خەلکی هەمییێ دکەت کو ئەو بێن و بەرێ خۆ بدەنە ڤی تشتی جوانییەکا تمام هەی، بێی کو ب ئاشکەرایی بێژت کانێ ئەو تشت چییە، هەر وەکی وی دڤێت زانینا وی بۆ وان بکەتە (موفاجەئە)، دبێژت:

**خەلقۆ وەرن ببینن**
**چ حوسنەکە ل کەمالە**
**حەیران ژ دل بمینن**
**ل صونعا ذولجەلالە**

گەلی مرۆڤان، وەرن ڤێ عەجێبییێ ببینن، دا بزانن کانێ چ حوسنەکا تمام و کاملە، و دا هوین ب دورستی و ژ دل حەیران و حێبەتی بمینن ژ بەر ڤی چێکرییێ خودایێ خودان مەزنی.

**صونعا خودێ وە دایی**
**صەفحە ژ نوورێ داینایی**
**عەنبەر ل سەر کێشایی**
**ئەبروو و خەط و خالە**

ئەڤ چێکرییێ خودان حوسن و جەمالا کامل چییە؟ دبێژت: ئەو حوسنا هوین دێ ژی حەیران مینن، ژ چێکرنا خودێیە، و خودێ ئەو وەسا دایە کو پەڕەک بت ژ ڕۆناهییێ، مەعنا: ئەو وەکی پەڕەکێ سپییە دێ بێژی ڕۆناهی یا ل سەر هاتییە دانان، یان عەنبەر یا ل سەر هاتییە کێشان، لەو هندە یێ زەلال و بێنخۆشە، ئەڤ صەفحە بروی و خەت و خال ل سەر ددانایندە.. مەعنا: ئەو تشتێ شاعر داخوازێ ژ خەلکی دکەت کو بێن و بەرێ خۆ بدەنێ دێمێ بێ وێنەیێ دلبەرێیە.

**خالێـــت شـــوبهی عەنبـــەرێ**
**دێـــم هـــەر وەکـــی قەمـــەرێ**
**ئـــەز تێـــر نـــابم ژ نەظـــەرێ**
**مـــن قـــەط ناچیـــت ژ خیالـــە**

ئەو نیشانێن ل سەر دێمێ دلبەرێ هەین یێن وەکی عەنبەرێ بێنخۆش، و ئەو دێمێ وەکی هەیڤێ ڕوهن و زەلال، چو جاران ئەز ژ بەرێخۆدانا وان تێر نابم، و قەت ئەو ژ سەر هزر و خیالا من ناچن.

**مـــن قـــەط ناچیـــت ژ بیـــرە**
**زولفێـــت شـــوبهەت حـــەریـــرە**
**ل ســـــەر بـــــەدرا مــــونیرە**
**داگرتبـــــــــوون هلالــــــــە**

بسکێن دلبەرێ یێن وەکی حەریر و ئارمیشی قەت ژ بیرا من ناچن، ئەو بسکێن ب سەر وی دێمی دا هاتین یێ وەکی هەیڤا چاردەشەڤی، و تێ ئالیاین و کڤانەکێ وەکی هەیڤا ئێکشەڤی ل دۆر چێکری.

ئــــــەبروو هــــــلالا عیـــــدێ
ئەبلـــــەق شــــوبهی ناهیـــدێ
دێـــم هـــەر وەکـــی خورشـــیدێ
جەبهـــــەت مـــــەها ل کەمالــــە

بروییێن وێ وەکی وێ هەیڤێنە یا ل شەڤا چەژنا رەمەزانێ دیار دکەت، کو وەسا یا زراڤە زوی ب زوی نائێتە دیتن، و ئەو چاڤێن بەلەک یێن وەکی کەوکەبا زوهرەیێ (ستێرا سپێدێ) یا گەش، و دێمێ وەکی ڕۆژێ هەیڤا هەمی گاڤان گەش و گرۆڤر، و ئەنییا وێ ئەو هەیڤە یا هەردەم ل کاملانێ.

جەبهـــــەت مـــــەها تەڤالــــە
ڕوو ســـــۆرگولا ب خوناڤــــــە
ڕەیحـــــان هاتنــــە هنداڤــــە
نەســــــرینان دا ڤـــــێ پالــــە

ئەنییا وێ هەیڤا چاردەشەڤی یا تمامە، و ڕوییێ وێ سۆرگولەکا خوناڤگرتییە، و پەرچەما وێ یا وەکی داڤا ڕەشە رحانێ نازک و بێنخۆش یا هاتییە هنداڤی وی دێمی، و نەسرینان (کو گولەکا سپییە) پالێ خۆ یێ دایە وان رحانان. و بەلکی مەخسەد

ب نەسرینان تۆقە و تیت و بەریسک بن بێن دلبەرێ پرچا خۆ پێ گرێدای.

**نەســـرینان جۆقـــەت بەســـتە**
**مـــن نێرایـــێ ب هەوەســـتە**
**عـــەقلێ مـــن چـــوو ژ دەســـتە**
**حـــــەیران کـــــرم دەر حالـــــە**

گول نەسرینان جۆق و کۆما خۆ یا ل سەر ڤی دێمی گرێدایی، و دەمێ من ب عشق و هەوەسەکا زێدە بەرێ خۆ دایێ، من عەقل و سەودایێ خۆ ژ دەست دا، و ئەز دین و شەیدا بووم، و دەر حال وێ ئەز حەیران و مەندەهووش کرم.

**حـــەیران بـــووم ئـــەز ل دینـــێ**
**ســـــــۆتم دەردێ ئـــــــەڤینێ**
**ژ خـــۆ ناکـــەم هیڤیـــا ژینـــێ**
**ل مـــن کێمبـــوون مەهـ و ســالە**

ژ بەر دیتنا وێ ئەز حەیران و مەندەهووش بووم، و ژ بەر دەردێ ئەڤینا وێ ئەز سۆتم، و چو د من نەما، بەلێ د سەر هندێ ژێ را کو ژ بەر کول و کۆڤانێن عشقا وێ عەمرێ من چوو و مەهـ و سال ل من کێمبوون، بەلێ ژ خۆ بێ هیڤی نابم، و من ئومێدا گەهشتن و ویصالا وێ هەر دێ هەبت.

**موصـــحەفا خـــەطط و خـــالان**
**مـــــــــــــەتنێ ژ لام و دالان**

**ژ بـــەر زەحمـــەت ئەشـــكالان**
**كـــــەس ناكـــەتن مطالـــــە**

(موصـحەف) ئـەو پـەڕێن سـپينە يـێن نڤيسـين ل سـەر دئێتـە قەيدكرن، و ئەو ل ڤێرێ ئستيعارەيە بۆ دێمی، و (لام) ئـەو حەرفـە يـا د ڕێنـڤيسـا عـەرەبی دا بنـێ وێ وەكی گـۆپالی خـوار، و ئـەو ل ڤێرێ ئستيعارەيە بۆ بسكێ، و (دال) ژی حەرفەكا خوارە، بـەلێ ئـەو د نيڤـی ڕا يـا شكەسـتييە، و ئـەو ل ڤێـرێ ئسـتيعارەيە بـۆ پەرچەمێ دەمێ با لێ ددەت د شكلێ خۆ دا وەكی حەرفا دالێ لێ دئێت، و ئاشكەرايە كو (د) و (ل) پێكڤە دبنە دل!

شـاعر دبێـژت: ئـەو موصـحەفا خـەط و خـال ل سـەر هاتينـە نەخشـاندن، و ئـەو مـەتنێ لام و دال تێـدا هاتينـە نڤيسـين، ژ بـەر وی شكلێ عەنتيكـە و ب زەحمـەت يـێ ئـەو پـێ هاتييـە قەيـدكرن، چـو كـەس نەشـێن ب دورسـتی بخـوينن و ب تمـامی تـێ بگـەهن. مەعنا: ئەو جەمالا دێمێ دلبەرێ پێ هاتييە چێكرن، هند يا مـەزن و عەجێبە كەس نەشێت ب دورستی فام بكەت!

**ژ چاڤـان مـن خـوون ت بـاری**
**ژ دەســت ئەبلــەقێت خومـــاری**
**وەكــــی ئاڤێـــت ت جـــاری**
**بـــێ وەقـــت و بـــێ مەجالـــە**

ژ بـەر وان چـاڤـێـن بەلـەک و مەست و خاڤ خوين وەكی جۆ و جۆبـارێن بـۆش ژ چاڤێن مـن دبـارت و دچت، و هاتنـا وێ ئاڤـە

خوینیّ ژی یا بیّ وەقت و مەجالە، مەعنا: ژ بەر دویراتییا من ژ چاڤێن یارێ یێن بەلەک، یان ژ بەر دیتنا من بۆ وان چاڤان هەمی گاڤ و سەعەتان رۆندک ژ چاڤێن من دبارن.

**وەصـــــفێت ت نازەنینــــــان**

**مـــــەدحێت ت سورشـــــرینان**

**وەکـــــی دوڕڕ و یاســــمینان**

**ت بێــــژم ئــــەز عەمالـــــە**

(نازەنین) دلبەرێن جوان و نازکن، و (سوڕشرین) ئەو جوانێن خودان جازبییەتن یێن ب شرینییا خۆ مرۆڤی ب نک خۆ ڤە دکێشن، شاعر دبێژت: کار و کەسپێ من ئەوە ئەز هەردەم سالۆخەتێن نازەنینان، و مەدحێن سوڕشرینان، وەکی دوڕ و ئاسمینان دبێژم و ڤەدهینم.

د کەشکۆلا دیوانا جزیری دا (وەکی دەور و یاسینان) ل شوینا (وەکی دوڕڕ و یاسمینان) هاتییە، و دەور و یاسین ئەو قورئانە یا ل سەر وان کەسان دئێتە خواندن ئەوێن دکەڤنە بەر مرنێ، یەعنی: د بەر مرنێ ڕا ئەز مەدحێن وان دخوینم و دبێژم.

و ئەو چ وەصف و مەدحن یێن ئەو دبێژت؟ شاعر دبێژت:

**گـــــەردەن شیشـــــا نـــــەباتێ**

**لێـــــڤ شـــــەربەتا حـــــەیاتێ**

**ئـــەز پـــێ ت بیـــنم نـــەجاتێ**

**ژ دەردێ پـــــوڕ مەلالــــــە**

گەردەنا وێ یا سپی و زەلال ئەو شیشەیە یا تژی شەکر، و لێڤێن وێ ئەو شەربەت ژێ دبارت یا وەکی ئاڤا حەیاتێ مرۆڤ پێ دمینتە زێندی، و ئەو شەربەت ئەوە یا ئەز پێ ژ دەردێن نەخۆش و تژی زەحمەت ڕزگار دبم، و بۆ من دبتە دەرمان.

لێڤێت شـوبهی نـەباتێ
ئـەز نـادەم ب حـەیاتێ
ژ حوسـنا بـوت و لاتـێ
ب مـن جاهـ و جەلالـە

ئەو لێڤێن وەکی شەکرێ شرین، ئەز نادەمە ب ژیانێ هەمییێ، یان: ئەو ئاڤا شرینا ژ لێڤێن وێ دبارت ئەز نادەمە ب ئاڤا حەیاتێ، و ژ بەر حوسن و جەمالا وێ دلبەرا د دەسهەلاتا خۆ دا ل سەر عاشقی وەکی صەنەمێ بوت و لاتی ل سەر پەرستڤانێن وان، ئەو ب من و بۆ من مەزنی و مەنصبێن بلّندە. مەعنا: ئەگەر ئەو بگەهتە من، من چو مەزنی و مەنصبێن بلند نەڤێن.

حوسـنا تـە یـا حەبیبـە
دلـێ مـن ژێ غەریبـە
یەللاهـ تـو بکـەی نەصـیبە
دەسـت بـدەتن وصـالە

ئەی دلبەرا خۆشتڤی، هەردەم دلێ من خەریبێ حوسن و جەمالا تەیە، و بیریا تە دکەت، ڤێجا یا خودێ تو وێ بکە

نەصیبێ من، و تو بکە ئەو رەحمێ ب مە ببەت و دلێ وێ د دەر حەقێ مە دا نەرم ببت، و دەست بدەت ویصالا مە و مە ژ گەهشتن و دیدارا خر بێبار نەکەت.

**حوسنا تە یا دلخواهە**
**ت بەر لبسێ سیاهە**
**ب من کەعبەتوللاهە**
**طەواف بکەم هەر سالە**

ئەی خۆشتڤی، جوانییا تە یا دلخوازە، و گەلی هەڤالان، دلبەرێ کراسەکێ رەش ل بەر خۆ کرییە، لەوا ئەو ل بەر من د رەنگ و هەیبەتا خۆ دا وەکی کەعبا خودێیە، ئەز دخوازم هەر سال طەواف بکەم و ل دۆر بزڤرم!

**باغێ کو هەر بوهار لێ**
**سونبول و لالەزار لێ**
**چەند کولیلکێت ب خال لێ**
**بولبولی نالەنالە**

ئەڤە ژی هەر سالۆخدانا دێمێ دلبەرێیە، دبێژت: ئەو باغێ گەش و خەملینێ هەردەم لێ بهار، و تژی سونبول و بیتانۆک، و چەند کولیلکێن ب خال و نیشان لێ هەین، بلبلێ عاشق و شەیدا ژ بەر وی باغی هەمی گاڤان نالنالە.

بلبل ئستیعارەیە بۆ عاشقێ شەیدا.

دێمـــێ خالێـــت د هـــوور لـــێ
ئـــەنیا زولفێـــت شـــوتوور لـــێ
ڕەونـــەڤا کـــۆهێ طـــوور لـــێ
مەحبووبـــــە بـــــێ میثالـــــە

(شوتوور) یان (شوتور) ب فارسی حێشترە، و ژ بەر مەزنییا ڤی حەیوانی و پشتا وی یا خوار هندەک جاران ئەو وەک کینایەت بۆ تشتێ مەزن و خوار دئێتە گۆتن. دبێـژت: ئـەو دێمـێ خـال و نیشـانێن ڕەش و هویر لـێ هـەین، و ئـەو ئـەنییا بسـکێن خـوار کەفتینـە سـەر، و ڕەونـەڤا وێ زەلال و پیـرۆز وەکـی یـا چیـایێ طووری، ئەو مەحبووبەکا بێ هەڤتا و بێ وێنەیە.

مەحبووبـــــە بـــــێ هەمتایـــــە
قامـــــەت ســـــەلوا بالایـــــە
گیســـــۆ شـــــەڤا یەلدایـــــە
گـــــەردەن ب خـــــۆ شـــــەمالە

ئەو مەحبووبەکا بێ هەڤتایـە، و کـەس وەکـی وێ نینـە، بـەژنا وێ وەکی دارا سـەرۆیـێ ڕاست و زراڤ و بلند، و پرچا وێ ڕەش و تاری وەکی شەڤا یەلدا، کو درێژترین شـەڤە د سالێ دا، گـەردەنا وێ ب خـۆ شـەمالـە ڕۆنـاهـیـێ ددەت. و کرنا بەحسێ شـەمالێ د گەل شەڤێ جوانییا خۆ یا تایبەت هەیە.

گـــــەردەن شـــــەمعا کـــــافووری
پـــــەردە ل ســـــەر ژ نـــــووری

**رەونـــــەقێ دا ڤ طـــــوورێ**
**تەجـــــەللا كـــــر جەمالـــــە**

گـەردەنـا وێ د سپیاتی و زەلالییا خـۆ دا دێ بێـژی چرایەکە ژ کـافـووری هـاتـیـیـە چـێـکـرن، و پـەردەیـەک (یان شیشەیەک) ژ رۆناهییێ ب سەر دا ئینایە خوارێ، ڤێجا رەونەق و رۆناهییا وێ دایە وی طووری یێ حوسن و جەمال لێ خویابووی.

(طـوور) ل ڤێـرێ ئسـتیعاریە بـۆ دێمـی، یـان: سـنگی، کـو گەردەن رەونەقێ ددەتێ.

**تەجـــــەللا کربـــــوو جـــــارەک**
**حوســـــنا خـــــۆ یـــــا موبـــــارەک**
**(أحســـــن اللـــــه تبـــــارک)**
**چ شەمســـــە بـــــێ زەوالـــــە**

مەحبووبی ب حوسنا خۆ یا پیرۆز و موبـارەک تـەجللا ل سـەر وی طـووری کربوو، یەعنی: مـەحبووبێ حـەقیقی کـو خودێیـە، کـانێ چاوا ل سەر چیایێ طـووری تەجەللی بۆ مووسایی کربوو، وەسا وی تەجەللی بۆ مە ژی ل سەر ڤی دێمی کر لـەو ئەو هندە د چاڤێن مـە دا یێ گەشـە، و پاکی و پیـرۆزی بـۆ خـودێ بت، ئـەڤ دێمـە چەنـد رۆژەکـا گەشـە یـا چـو جاران نـەکـەڤـت و بـەر ب ئاڤـابوونێ ڤـە نەچت!

**زولفێـــــت شـــــەهلەوەندان**
**بســـکێت مـــەحبووب و رەنـدان**

ئێخســـتمە قەیـــد و بەنـــدان
بەردانەڤـــــــە مەحالـــــــە

(لەوەند) ئەوە خۆشتڤییە یێ ب جوانی و نازکییا خۆ مرۆڤی دئازرینت، و (شەهلوەند) شاهێ وانە.

شاعر دبێژت: زولفێن خۆشتڤییێن شەهلەوەند، و بسکێن دلبەرێن نازک ئەز ئێخستمە قەید و بەندێن خۆ، و ئێخسیرکرم، و جارەکا دی بەردانا من ژ وان قەید و زنجیران تشتەکێ موستەحیلە و چو جاران چێ نابت.

چاڤێـــت شـــۆخ و شـــەنگان
غـــــەمزێت دل فرەنگـــــان
دل دا ڤ بـــــەر غـــــەدەنگان
خـــوون ڤـــەخوارن حەلالـــە

چاڤێن دلبەرێن شۆخ و شەنگ، و غەمز و ئیشارەتێن وان دل فرەنگان، یەعنی: ئەوێن وەکی فرەنگان دلرەق، دلێ من دا بەر تیرێن ئاورێن خۆ، هەر وەکی ل نک وان کارەکێ حەلالە کو ئەو خوینا من برێژن، یان حەتا فرِ کەن ژی!

مـــــەحبووبا دلنـــــەوازان
بلنـــــدا ســـــەرفرازان
عالـــەم قرِکـــر ب نـــازان
ڤـــەت نابێژیـــت وەبالـــە

ئەو خۆشتڤیيا دلی نەرم و کەیفخۆش دکەت، یا سەرفەراز و بەژن بلند، عالەم هەمی ب نازێن خۆ قرکر و کەس ژێ نەهێلا، د گەل هندێ ژی ئەو قەت نابێژت: ئەڤە کارەکێ گونەهە ئەز دکەم!

**ژ مصرێ بینن خەراجێ**
**ژ هندێ بکەن تاراجێ**
**ژ رۆمێ بستینن باجێ**
**ژ بۆ خەملا یا دەلالە**

هوین گەلی گوهداران، بۆ خەمل و خێزا دلبەرا مە یا دەلال، ئەوا د حوکم و دەسهەلاتا خۆ دا وەکی سولطانان، خەراجێ ژ مصرێ بینن، و تالانی ژ هندێ بینن، و باجێ ژ رۆمێ بستینن.

و چونکی ل سەردەمێ شاعری مصر ئێک ژ وەلاتێن موسلمانان بوو وی گۆت: خەراجێ بینن، و هند ب تمامی د گەل دەولەتا ئیسلامێ نەبوو وی گۆت: تالانێ ژ وێرێ بینن، و رۆم (ئۆروپا) دوژمن بوون گۆت: باجێ ژ وێرێ بینن.

**ژ هندێ بینن تالانێ**
**بکەن کلێ سوبحانێ**
**ژ بۆ چەهڤێت شەهـ سولطانێ**
**دەما تێتن سەرسالە**

هوین تالانێ ژ هندێ بینن، و کلێ سوبحانی بۆ چاڤێن شەهـ و سولطانا مە چێ بکرِن؛ دا ئەو وی د چاڤێن خۆ بوەرینت دەمێ جەژن و سەرسال دئێت.

**چەنـد بێـژی عـەلییێ صـادق**
**ژ ئەسـرار و دەقـائق**
**ئـەڤان وەصـفێت لائـق**
**ژ حوسـنا یـا دەلالـە**

هنـدی عـەلییێ راستگۆ ژ سرر و نهێنییێن هـویر بێـژت و خەبـەر بـدەت، و بەحسـێ حوسـنا دلبـەرا دەلال بکـەت و وەصـفێن لائقێن وێ بێژت.. ئـەو ژ راستییێ دەرناکـەڤت، چونکی ئـەو یـێ صادقە، و دلبەر یا لائقە!

و وەکی مە ل دەسپێکێ گۆتی، چونکی ئەڤ شعرە د هنـدەک دانـەیـان دا بـۆ (صادقی) دئێـتـە پالدان، نە کو عەلییێ حەریری، د وان دانەیان دا دووماهی ب ڤی رِەنگییە:

دێ چەنـد ببێـژی صـادق
ژ ئەسـرار و دەقـائق
ئـەڤان وەصـفێ ت لائـق
ژ حوسـنا یـا دەلالـە

## شعرا هەشتێ

ڕوو بەر دەرێ جەببار بکەن
دونیا بەطالەست ئەی عەلی
تەرکا دنێ یەکجار بکەن
ئاخر زەوالەست ئەی عەلی

وەقتە بچن زەوق و صەفا
پەیدا ببن جەور و جەفا
تەحقیق بزانە بێ وەفا
خەون و خەیالەست ئەی عەلی

خالق ب خوە گۆت ئەڤ سوخن
کو ئافرین ئنسان و جن
(لا تعبدوا إلا) ئەمن
قەولێ جەلالەست ئەی عەلی

قەولێ جەلال تو طەرح مەکە
دونیا حەرام موباح مەکە
ئەو قەحبەیە نیکاح مەکە
زانی چ حالەست ئەی عەلی

زانی چ حالەست ئەو صەلیت
ئیرۆ هەیە صوبحێ دچیت
زوو دە طەلاق صاتێکە تیت
وەقتە مەجالەست ئەی عەلی

ئەو پیرەژن صەد قەحبەیە
قانوونا وێ دائم وەیە
ئەو دوژمنا مێرێ خوەیە
ئەو بووکە کالەست ئەی عەلی

ئەو بووکە پیرە حیلەباز
جادۆ و مەککار حیلساز
بووکا ل وێ چێتر بخواز
صاحب جەمالەست ئەی عەلی

یا عەلی بەس کە گۆتنێ
جارەک ژ بیرکە موردنێ
کو چەند شیرینە ئەڤ دنێ
ئاخر بەطالەست ئەی عەلی

# ڕوو بەر دەرێ جەببار بکەن

ئەڤ شعرە ل سەر وەزنا (رەجەزا هەشتەیی) یا هاتییە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رِەنگییە: (مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ مُسْتَفْعِلُنْ)، و ئەو د دەستنڤیسا شێخ ئەحمەدێ فەقیرێ گوندشێخی ب تنێ دا هاتییە.

مژارا ڤێ شعرێ وەکی ئاشکەرا ل دۆر شیرەتێ زوهدێیە، کو مرۆڤ دلێ خۆ نەبەتە دنیایێ؛ چونکی دووماهییا وێ هەر فەنایە، و مانا تێدا تشتەکێ بەطال و بێ بناخەیە، و شاعر گۆتنێ ئاراستەی خۆ ب خۆ دکەت، و د دووماهییا هەر مالکەکێ دا دبێژت: (ئەی عەلی) و مەخسەدا وی پێ خواندەڤان و گوهدارێ شعرێیە ژی.

ڕوو بەر دەرێ جەببار بکەن
دونیا بەطالەست ئەی عەلی
تەرکا دنێ یەکجار بکەن
ئاخر زەوالەست ئەی عەلی

ژ بەر کو د ڤێ مالکێ دا ب تایبەتی، و ڤێ شعرێ ب گشتی شاعر گۆتنێ د گەل خۆ دکەت، ئەز دویر نابینم پەیڤا (بکەن) د بنیات دا (بکە) بت، بەلێ چونکی د بنیات دا ئەو ب ڤی ڕەنگی هاتییە، لەو مە ژی ئەو وەسا دانایە، شاعر دبێژتە خۆ، یان دبێژتە گوهدار و خواندەڤانێن شعرا خۆ ب گشتی: هوین هەمی پێکڤە بەرێ ڕوییێ خۆ بدەنە بەر دەرێ خودایێ جەببار و کوتەککار، یێ کو چو کار ل بەر وی ئاسێ نەبن، و تو -ئەی عەلی- باش بزانە کو ئەڤ دنیایە یا بەطالە؛ چونکی ئەو یا فانییە، ڤێجا مادەم وەسا هوین دنیایێ ب ئێکجاری بهێلن، و پشت بدەنێ، ئەو دنیایا دووماهییا وێ هەر دێ ل سەر پویچبوونێ و زەوالێ ڕاوەستت. ئەگەر هەوە عەقلەکێ دورست هەبت هوین دێ پشت دەنە وارێ زەوالێ کو دنیایە، و بەرێ هەوە دێ مینتە ل ملکێ هەر و هەر دمینت کو ئاخرەتە.

**وەقتــــە بچـــن زەوق و صـــــەفا**

**پەیـــدا بـــبن جـــەور و جـــەفا**

**تـــەحقیق بزانـــە بـــێ وەفـــا**

**خەون و خەیالەست ئەی عەلی**

ژیێ هەوە، وەکی یێ دنیایێ ب خۆ ژی، پتر یێ چووی، و کێم ژێ مایە، و نێزیکە ئەو زەوق و خۆشی و ڕحەتیا هوین د ڤێ دنیایێ دا بینن خلاص ببن و بچن، و نەخۆشی و زۆر و زەحمەتا مرنێ و قەبری و ئاخرەتێ بێت، ڤێجا پێتڤییە هوین کارێ

خۆ بۆ ڤێ چەندێ بکەن، و تو -ئەی عەلی- ب پشتڕاستی بزانه کو ئەڤ دنیایە یا بێ وەفا و هەڤالهێلە، ئەو خۆ ل کەسێ ناکەتە خودان، و ئەو وەکی خەونەکا شرین و خەیالەکا خۆشە، بەلێ مخابن چو مان و ڕاستی بۆ وێ نینن.

خالق ب خوه گۆت ئەڤ سوخن
کــو ئــافرین ئنســان و جــن
(لا تعبـــدوا إلا) ئـــــەمن
قــەولێ جەلالــست ئــەی عــەلی

ئافرانـدن و هاتنـا مـە بـۆ ڤـێ دنیـایێ بـۆ هنـدێ نینـە کـو ئـەم کەیف و خۆشییێ تێدا ببەین، و هـەر و هـەر لـێ بمینـین، نـەخێر.. ئەو خـودایێ ئـەم ئافرانـدین و دانایـنـە د ڤـێ دنیـایێ دا، وی ب خـۆ ئەڤ گۆتنە گۆتییە، کو مرۆڤ و ئەجنـە مـن بـۆ هنـدێ ئافراندینـە دا ئەو پەرستنا من ب تنێ بکەن، دەمێ گۆتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝ ﴾ (الـذاريات: ٥٦)، ئـەڤ گۆتنـە -ئـەی عەلی- گۆتنا خودایێ مەیە یێ خـودان مـەزنی، لـەو تـو خـۆ ژێ بـێ ئاگەهـ نەکە، و کاری پێ بکە.

قــەولێ جــەلال تــو طــەرح مەکــە
دونیـــا حـــەرام موبـــاح مەکـــە
ئـــەو قەحبەیـــە نیکـــاح مەکـــە
زانــی چ حالــست ئــەی عــەلی

تو گۆتنا خودایێ مەزن ب پشت گوهـ ڤە نەهاڤێژە، و وێ لانەدە، و کاری پێ بکە، و دنیایا حەرام بۆ خۆ حەلال نەکە و دلێ خۆ نەدەیێ، و کاری بۆ نەکە؛ چونکی هندی مەتەلا دنیاییێیە وەکی مەتەلا وێ ژنێیە یا خراب و دەهمەنپیس، و مرۆڤێ پاقژ و سلامەتی بڤێت تێکەلی ژنا ب ڤی ڕەنگی نابت، ڤێجا تو -ئەی عەلی- بزانە کانێ حالێ دنیایێ یێ چاوایە؟

و تەشبیهکرنا دنیایێ ب ژنا خراب ڤە، تەشبیهەکە هێشتا د کەڤن دا د ناڤ ئەدیب و نڤیسەران دا یا بەلاڤە و تشتێ وەکهەڤ د ناڤبەرا هەردویان دا ئەوە ئەو بۆ کەسێ نابنە مال، و ب دورستی دلێ خۆ ژی نادەنە کەسێ، مەلا ئەحمەدێ نالبەند د ڤێ مەعنایێ دا دبێژت:

دونیا نە یارا کەس ژ مەیە    تەشبیهی ژنکا قەحبەیە
جار بۆ منە جار بۆ تەیە    کێ تازە دارا وێ چنی؟!

وەقتێ کەتە د دەستێ تە دا    یارێ بەرێ هێژ بەرنەدا
هەر سال گەهشتە سێسەدا    پاشی دلێ وان هنجنی

پاشی حەریری بەحسێ حالێ کرێتێ دنیایێ دکەت و دبێژت:

**زانی چ حالەست ئەو صەلیت**
**ئیرۆ هەیە صوبحێ دچیت**
**زوو دە طەلاق صاتێکە تیت**
**وەقتە مەجالەست ئەی عەلی**

(صەلیت) ب ڤی ڕەنگی د دەستنڤیسێ دا هاتییە، و بەلکی د بنیات دا ئەو (سەلیط) بت، و ئەڤ پەیڤەکا عەرەبییە بۆ وی کەسێ ئەزمان خۆش و ئەزمان درێژ ژی دئێتە گۆتن، و ئەو ل ڤێرێ سالۆخەتێ دنیاییێیە، یەعنی: تو دزانی حالێ دنیایا ئەزمان خۆش و ئەزمان درێژ چییە؟

حالێ وێ ئەوە ئەو -وەکی ژنا خراب- ئەڤرۆکە یا تەیە و یا ل نک تە، بەلێ سوباهی سپێدێ ئەو دێ تە هێلت و گەهتە ئێکی دی! ڤێجا مادەم ئەو یا ب ڤی ڕەنگییە تو زوی وێ بەردە و خۆ ژێ خلاص بکە، و دلێ خۆ نەدەیێ، و هندەک دەم دەمێ بەردانا وێیە ئەی عەلی، ڤێجا تو خۆ گیرۆ نەکە.

و (صاتێکە تیت) وەکی د دەستنڤیسێ دا هاتی، ئەز ب دورستی تێ نەگەهشتیمە، بەلکی (صاتێک) د بنیات دا (ساتێک) بت یەعنی: سەعەتەکە، و (تیت) بەلکی (تێت) بت ژ بەر قافییێ وە لێ کربت، یەعنی: دەمەکی ئەو تێت و دچت، و وەقتە تو وێ بەردەی.

**ئـەو پیـرەژن صـەد قەحبەیـە**<br>
**قانوونـا وێ دائـم وەیـە**<br>
**ئـەو دوژمنـا مێـرێ خوەیـە**<br>
**ئەو بووکە کالست ئەی عەلی**

ئەڤە ژی هەر وەصف و سالۆخەتێ دنیاییێیە، دبێژت: ئەڤ دنیایە، ئەگەر چ د چاڤێن خودانان دا یا شرین و جوان ژی بت،

بەلێ ئەو پیرەژنەکا چرچ و خرابە و صەدان ئەو یا دەستڤەدای، و هەر جارەکا ئەو گەهشتبتە ئێکێ و لێ هاتبتە مارەکرن ژی وێ ئەو یێ کوشتی و بن ئاخکری؛ چونکی عەدەتێ وێ ئەوە ئەو دوژمنا مێرێ خۆیە، و ئەگەر ئەو بووکەکا جوان ژی بت دڤێت تو -ئەی عەلی- ژ بیر نەکەی کو ئەو کالەکا پیرە، و چو خێر تێ نەمایە.

**ئەو بووکە پیرە حیلەباز**
**جادۆ و مەککار حیلساز**
**بووکا ل وێ چێتر بخواز**
**صاحب جەمالست ئەی عەلی**

ڕاستە ئەو بووکە بەلێ پا ئەو پیرەکا حیلەبازە، خۆ ب ڕەنگەکێ جوان و تازە نیشا تە ددەت و ئەو ب خۆ کالەکا کرێتە، ئەو سێرەبەند و فێلبازەکا ب لەعب و لیتە، باوەرییا خۆ قەت پێ نەئینە، و ژێ ئێمن نەبە، و دا تو ژێ ب سلامەت بی و نەکەڤییە داڤێن وێ تو بووکەکا ژ وێ چێتر و باشتر بۆ خۆ بخوازە، کو ئاخرەتا بەردەوامە، ئەو یا خودان جەمالەکا ژ ڕاستییە نە وەکی ڤێ بووکا پیر و خاپینۆک.

ڤێجا تو -ئەی عەلی- وێ بۆ خۆ بخوازە، و کاری بۆ ب دەستڤەئینانا وێ بکە، ئەگەر تە خۆشییا ب دورستی و ئەبەدی دڤێت.

**یــا عــەلی بــەس کــە گــۆتنێ**
**جـــارەک ژ بیرکـــە مـــــوردنێ**
**کــو چەنـد شــیرینە ئــەڤ دنــێ**
**ئــاخر بەطـالـەســت ئــەی عــەلی**

(موردەن) ب فارسی مرنە، و هندەک جاران ئەو ب رامانا وەستیانا زێدە و ڤیانا ژێدە ژی دئێتە گۆتن، دبێژن: ئەز ب فلان کاری ڤە مرم، یەعنی: من وەستیانەکا زێدە پێڤە بر، یان ئەز بۆ فلان کەسی مرم، یەعنی: ڤیانا من بۆ وی یا زێدەیە. شاعر دبێژتە خۆ: ئەی عەلی، تو گۆتن و گالگالان بەس بکە، و ڤێ وەستیانا زێدە ژی ژ بۆ دنیایێ ژ بیرا خۆ ببە، خۆ زێدە پێڤە نەوەستینە، راستە ئەڤ دنیایە گەلەک یا شرینە، بەلێ ژ بیر نەکە دووماهییا وێ ئەو یا بەطالە، دێ پویچ بت و ژ دەست تە دەرکەڤت.

## شعرا نەهێ

گـەلۆ دلبـەر وە بیـر نـایێ
ئەسـیرەک وێ د زنـدانێ
نزانـی کـەس ب وێ حـالێ
ضـەعیفم ئـەز ل هجرانـێ
ل هجرانـێ قـەوی لـەنگم
د نالیـان ڕا ئـەز هەڤـدەنگم
خەبـەر کـن دلبـەرا شـەنگم
غـەمم لـێ هاتنـە مەیـدانێ
غـەمان ئـالا ل مـن بەسـتە
هـەمان دەعـوا ژ دوور خوەسـتە
ژ دلـێ مـن ڕا مـراد قەسـتە
عـەزیزا غـەمرەوین کـانێ
عـەزیزا غـەمرەوین بـا کـن
ل سـەر چەشـمان جیـی چا کـن
دلـێ مـەحزوون ب وێ شـا کـن
خـلاص کـن مـن ژ کـۆوانێ

ژ کـــــۆوانێ نـــــەبم خـــــالی
نـــــەما ئـــــاخر نـــــەبن نـــــالی
رەفیقـــێ وان غـــەم و تـــالی
ل دەســت غوصصــێ د دەورانــێ

ل دەســت وان ئـەبرۆ و چەشـمان
نە دل عەقل و نە جان هەش مان
د تــار و ظـولمـــەتا ڕەش مـــان
دو زولــــف هاتنــــە ســـــەیرانێ

دو زولفـــان تاریيـــا ڕەش کـــرد
دو بـەدران مـەشـعەلا گـەش کـرد
دلــێ مــن لـەو موشـەووەش کـرد
شـــەو و ڕۆژ هاتنـــە لێکـــدانێ

شـــەب و ڕۆژان کـــرین تـــالان
ب دەســــتێ وان ســــیەهخالان
ل دەســت وان هــەردو قـەتتالان
دو ئـــەبرو طـــاقێ ئـــەیوانێ

دو ئــەبرۆت قەوســێ یەنگینــە
سیەهـ گـۆش قەبضـێ زەنگینـە
خـــــەدەنگێ وان دو برۆينــــــە
ل دلـــــم پـــــڕ کـــــری ژانـــــێ

ل قــــەلبی پــڕ ل ســــەرتیران
ئامـــــانجێ جۆتـــەکێ میــران
رعایـــــەت نــــاکن پەخســــیران
خــەلاص کــن مــن ل زنــدانێ

ل زنـــــدانم ئـــەمان خوەســـــته
دەخیــــل بەنــدان بکـــن سســـته
جــەلاد و ســەرخوەش و مەســـته
قــەبوول ناکــا قــەط ئامـــانێ

قـــــەبوول ناکــــه تکاکــــاران
هــەلاکم ئــەز وەکــی جــاران
چ تــەدبیر کــین گــەلی یــاران
ل دەســـت خــەلقێ هندســـتانێ

ل هنــدێ تــۆب د ڕەش هــاتن
د رۆمیــــان خــوەش دەرا لاتــن
کەســــێ کــو بــەر دوان کــاتن
دزانــــــی کــــوفر و ئیمــــانێ

دزانـــــی ظـولـمـــەت و نــــوورا
حــــەوالێ زەنگـــی و حـــوورا
یـــەقین قـــانوون و دەســــتوورا
شــــــریکن ئـــــەو د تبــــالانێ

ب تـــــالان بـــــر د دل ژارا
ئـــيلان و عـــەقرەب و مـــارا
مەفـــەر نينـــە گونـــەهكارا
وەكـــى ئـــەو تێنـــە طوغيـــانێ
گونـــەهكارێ ل مێـــژم ئـــەز
دنـــالم هـــەر دبێـــژم ئـــەز
ژ چـــاوان خـــوون درێـــژم ئـــەز
و مـــن را يـــار كـــە ئحســـانێ
و مـــن را يـــار كـــە ئـــەڤ دەنگـــە
پلنگـــى خـــوە و مەلـــەك ڕەنگـــە
ب لـــەب شـــەكەر ب دل ســـەنگە
دو زولفـــێ شـــوبهى رەيحـــانێ
دو زولفـــێ شـــوبهى رەيحـــانن
مـــەديم جيرانـــێ خـــالانن
هـــەر وەكـــى ماهـــ و ســـالانن
ســـەرييان دا بـــۆ نيشـــانێ
نشـــانێ بـــێ نشـــان كـــردم
ل عـــەقل و هـــۆش و فـــام بـــردم
ل عشـــقت يـــا حـــەبيب مـــردم
وەرن گـــوێ بدنـــە ئـــەفغانێ

وەرن گــوێ بدێرنــە نالینــە
دوەســـــتن (لاتوبالی)نـــە
... ... ... کینـــــە
... ... ... ...
چ ڕەنــگ جۆبــار جــەیحوونی
... ... ... ...
... ... ... ...
دچــی ب ئــاوێ شــەطیانێ
حــەریری بەســکە هــاوارا
ل چــاوان بــەردە جۆبــارا
ل دەســـتێ فرقـــەتێ یــارا
فغــانم چوونــە ئەســـمانێ

## گەلۆ دلبەر وە بیر نایێ

ئـەڤ شـعرە ل سـەر وەزنـا (هـەزەجا هەشـتـەیی) یـا هاتییـە ڤەهاندن، و قالبێ وێ ب ڤی رەنگییـە: (مَفَاعِيْلُنْ مَفَاعِيْلُنْ مَفَـاعِيْلُنْ مَفَاعِيْلُنْ)، و مـە ئـەو ژ دو ژێـدەران وەرگـرتـیـیـە: دەستنڤیسـەک ژ کەشکۆلا مامۆستا محەمەد عەلی قـەرەداغی، و کتێبا (کـەلـهێن ئاڤا) یا سەیدا سەعید دێرەشی، و ئەو ئاشکەرا دکـەت کـو وی ئـەو ژ دەستنڤیسەکا بێ سەر و شوین و پاراستی ل بەرلینێ وەرگرتییە.

ئەڤ شعرە یا کو شێخ عەلییێ حەریری وەصفا حالێ خۆ تێدا دکەت ژ بەر دەردێ عشقێ و هجرانێ، ژ لایێ روخسار و ناڤەرۆکێ ژی ڤـە گەلـەک ب سـەر وێ شعرا مـەلایێ جزیـری ڤـە دچـت ئـەوا ب ڤێ مالکێ دەست پێ دکەت:

غـەما عشـقێ پـەرهتم ئـەز     حەبیبا غەم رەڤـین کـانێ؟
سەراسەر تێک بهێـتم ئـەز     ژ دەردێ فـەرق و هجرانـێ

و هەر کەسەکێ ڤان هەردو شعران بدەتە بـەرێک دێ زانـت کـو دویر نینە ئێک ژ وان ل بەر یا دی هاتبتە نڤیسین.

تشـتێ دی یـێ بـالـکێش د ڤـێ شـعرا عـەلـییێ حـەریـری دا ئـەوە ئەڤ شعرە -وەکی د هەردو ژێدەرێن مە دا هاتی- پتر ب سەر لەهجەیا (سوورچییان) ڤە دچت، ئەوێن گۆتنا وان ل هندەک جهـان پـتـر ب سـەر سۆرانـیـیـێ ڤـە دچـت، و ئـەگـەر هـات ئـەڤ چەنـدە ژ دەستکارییا نڤیسەران (ناسخان) نـەبت، و ئـەو ژ گۆتنا حـەریری ب خۆ بت، ئەڤە دێ وێ بۆچوونێ ب هێز ئێخـت یـا مـە ل پێشـییا ڤـێ کتێبـێ بـەحس ژێ کـری کـو دبـت عـەلـییێ حـەریری ئـەو شـێخ عەلـییێ حەریری یێ سوورچی بت یێ ناڤێ وی د وێ دەستنڤیسەکا کەڤن دا هاتی و ژێ دئێتە زانین کو ئەو ل سـالا ۱۰۷۱ مشـەختی یێ زێندی بوو.

د مالـکا ئێکێ دا ژ ڤێ شعرێ حەریری دبێژت:

**گـەلۆ دلبـەر وە بیـر نـایێ**
**ئەسـیرەک وێ د زنـدانێ**
**نزانـی کـەس ب وێ حـالێ**
**ضـەعیفم ئـەز ل هجرانـێ**

گەلی دۆست و هەڤالان، ئەرێ ما نائێتـە بیـرا دلبـەرا مـە کـو وێ ئـێـخسـیـرەک د زیندانێ دا هەیە؟ ڤێجا ئـەو د هـەوارێ بچـت، و وی ئـازا کـەت و رەحمـێ پـێ ببـەت؟! نێ ئەز د زینـدانا عشـق و هەجرا وێ دا ئێخسیرەکێ زیندانکریمە، و ئەگـەر وێ ئـەڤ چەنـدە ژ بیرا خۆ بر بت، بلا خودان خێرەک ڤێ چەندێ ل بیـرێ بینتـە ڤـە، بەلـێ ما چاوا ئـەڤ چەنـدە دێ چـێ بـت و کـەس ب وی حـالی یـێ

ئاگەهدار و زانا نینە یێ ئەز کەفتیمە تێدا؟ ئەز ژ بەر دووراتی و هجرانا دلبەرێ یێ بوویمە کسەکێ لەغەر و لاواز.

مەلایێ جزیری ژی دبێژت:

خەبەر بت بال شەکەرخایێ شەپال و خووب و زیبایێ
کو میرە بەلکی بیر نایێ ئەسیرەک وێ د زندانێ

بلا ئێک هەبت خەبەرەکی ببەتە نک دلبەرا گۆتن شەکر، وێ شۆخ و شەپالا کو میرە د هەیبەت و دەسهەلاتا خۆ دا؛ چونکی بەلکی وێ ژ بیر کر بت، بلا بێژتێ کو وێ ئێخسیرەک د زیندانێ دا هەیە.

**ل هجرانێ قەوی لەنگم**
**د نالیان ڕا ئەز هەڤدەنگم**
**خەبەر کن دلبەرا شەنگم**
**غەمم لێ هاتنە مەیدانێ**

د دووری و هجرانا دلبەرێ دا ئەز ژ پییان کەفتیمە و لەنگ بوویمە، و ئەز د گەل ئاخ و نالینان ئەز یێ بوویمە هەڤدەنگ، هەردەم دەنگێ من و دەنگێ نالینان پێکڤە دئێن، و ژ بلی نالینێ دەنگەکێ دی ژ من دەرناکەڤت، ڤێجا هوین -ئەی گەلی دۆستان- خەبەرێ من ببەن و بگەهیننە دلبەرا من یا شەنگ، دا ئەو ب حالێ من زانا ببت، و هەجرا خۆ ب دووماهی بینت؛ چونکی خەم و کۆڤان یێن هاتینە مەیدانێ و ل من کۆمبووین.

**غـــەمان ئـــالا ل مـــن بەســـتە**
**هـــەمان دەعـــوا ژ دوور خوەســـتە**
**ژ دلـــێ مـــن ڕا مـــراد قەســـتە**
**عـــــەزیزا غـــــەمرەوین کـــــانێ**

خـەم و کۆڤانـان ئـالایێ خـۆ دژی مـن هلدایـە، یـەعنی: وان شـەڕێ د گـەل مـن ڕاگەهانـدی، و هێشـتا ژ دویـر ڤـە و بـەری ئـەو بگەهنە من، وان دەعـوا یـا ل مـن کـری، و داخـوازا سـتاندنا حـەقێ خۆ ژ من دکەن! مرادا وان ئەوە ئەو بێن و قەسـتا دلـێ مـن بکـەن، و وی تـژی بکـەن ژ خـەم و کۆڤانـان. و ئـەرێ عـەزیزا مـن یـا کـو خەمێن من ب وێ دچن و نامینن کانێیە؟ ئەو یا دویرە ژ مـن لـەو خەم ڕێکا خۆ بۆ دلێ من دبینن.

**عـــەزیزا غـــەمرەوین بـــا کـــن**
**ل ســـەر چەشـــمان جیـــی چـا کـن**
**دلـــێ مـــەحزوون ب وێ شـــا کـن**
**خـــلاص کـــن مـــن ژ کـــۆوانێ**

گـەلی دۆسـتان، هـوین گـازی عـەزیزا خـەمرەڤین بکـەن، و داخـوازێ ژێ بکـەن ئـەو هەجـرێ بهێلت و ب سەر مە ڤـە بێـت، و هوین جهـێ وێ ل سـەر چاڤێن مـن دانـن؛ دا دەمـێ ئـەو بێـن ئـەو لـێ ئاکنجی ببت، و هوین دلـێ مە یێ خەمگین ب وێ شـاد و کەیفخۆش بکەن، و من ژ کول و کۆڤانان خلاص بکەن.

ژ کـــۆوانێ نــــەبم خـــالی
نـــەما ئـــاخر نـــەبن نـــالی
ڕەفیقـــێ وان غـــەم و تـــالی
ل دەســت غوصصـێ د دەورانــێ

هندی عەزیزا مە یا خەمڕەڤین نەئێت، ئەز ژ خەم و کۆڤانان ڤالا نابم، و نەمایە کو ئەز ل دووماهییێ نالینان نەکەم و فیغانان ڕانەهێلم، ئەز و نالین هەر و هەر دێ د گەل ئێک بین، و ئەز دێ هەڤالێ خەم و تالییێ بم، ژ بەر وان نەخۆشییێن ژ دەستێ چەرخ و دەورانێ دگەهنە من.

ل دەسـت وان ئـەبرۆ و چەشـمان
نە دل عەقل و نە جان هەش مان
د تــار و ظـولمــەتا ڕەش مــان
دو زولـــف هاتنـــە ســـەیرانێ

ژ بەر وێ زۆر و ستەما ژ وان بروی و چاڤان دگەهتە مە، نە مە دل و عەقل مایە نە جان و هش، ئەم دین و سەوداسەر بووینە، و د تاری و ظولمەتا ڕەش دا ماینە، ب تایبەتی دەمێ هەردو زولفێن دلبەرێ یێن ڕەش وەکی تارییا شەڤێ هاتینە سەیرانێ و کەفتینە بەرچاڤێن مە.

دو زولفـــان تارییـــا ڕەش کـــرد
دو بـەدران مـەشـعەلا گـەش کـرد
دلـێ مـن لـەو موشـەووەش کـرد
شـــەو و ڕۆژ هاتنـــە لێکـدانێ

دەما دلبەر هاتی، هەردو بسکێن وێ یێن ڕەش تاری پەیدا کر و ب سەر مە دا ئینا، و هەردو ڕویێن وێ یێن وەکی چرایی گەش ڕۆناهی بەلاڤکر، مەعنا: وێ ب هاتنا خۆ تاری و ڕۆناهی پێکڤە ئینا، ڤێجا ژ بەر ڤێ حنێرێ کو شەڤا بسکا وێ یا ڕەش و ڕۆژا دێمێ وێ یێ گەش پێکڤە هاتینە لێکدان و ل بەر چاڤێن من ئاشکەرا بووین، دلێ من موشەووەش و مەندەهووش ما.

شەب و ڕۆژان کرین تالان
ب دەستێ وان سیەهخالان
ل دەست وان هەردو قەتتالان
دو ئەبرو طاقێ ئەیوانێ

شەڤا زولفا وێ و ڕۆژا دێمێ وێ ئەم تالان کرین و چو د مە نەهێلا، و ئەو تالانکرن ب دەستێ وان نیشانێن ڕەش بوو یێن ل سەر ڕوییێ وێ هەین، هەر وەسا ب دەستێ وان هەردو چاڤان بوو یێن شەڕی ل سەر مە ڕادکەن و خوینێ درێژن. و دلبەرا مە خودانا دو برووییێن وەسانە ژ زراڤی و خوارییا وان دێ بێژی ئەو کڤانێ بەرسفک و ئەیوانێنە.

دو ئەبرۆت قەوسێ یەنکینە
سیەه گۆش قەبضێ زەنکینە
خەدەنگێ وان دو بروینە
ل دلم پڕ کری ژانێ

هەردو برووییێن تە -ئەی دلبەرا نازک- وەکی کڤانێن وەلاتێ (یەنگێ) یێن ناڤدارن، و گۆشەیا رەشا وان کڤانان یا کو خودان ب دەستێ خۆ دگرت دەمێ تیران ژێ دهاڤێژت، وەکی زەنگییان درەشن، و برووییێن تەنە ئەو کڤان یێن هندەک تیرێن وەسا ژێ دەردکەڤن کو دلێ من تژی ژان دکەن.

ل قەلبی پڕ ل سەرتیران
ئامانجێ جۆتەکێ میران
رعایەت ناکن یەخسیران
خەلاص کن من ل زندانێ

دلێ من یێ پڕە ژ وان سەرتیران یێن ژ کڤانێن تە ب من کەفتین، و ئەز کریمە ئارمانجێ جۆتێ وان چاڤان یێن د هەیبەتا خۆ دا وەکی میر و حاکمان، ئەو میرێن چاڤدێرییێ ل ئێخسیرێن خۆ نەکەن، و رەحمێ پێ نەبەن، ڤێجا هەوار هوین من ژ زیندانا ڤان میران خلاص بکەن!

ل زندانم ئەمان خوەستە
دەخیل بەندان بکن سستە
جەلاد و سەرخوەش و مەستە
قەبوول ناکا قەط ئامانێ

ئەز ئێک ژ وان ئێخسیرانم یێن ل زیندانا میران ئەمانێ دخوازم، و ئەز دەخیلێ هەوەمە هوین قەید و زنجیرێن خۆ ل وان بەند و گرتییان سست بکەن، و دلۆڤانییێ پێ ببەن، بەلێ یا ئەز

چ بکەم جەللادێ مە یێ سەرخۆش و مەست کو چاڤێن دلبەرێنە، قەت ئەمان و دەخیلییێ قەبوول ناکەن، و رەحمێ ب گرتیییێن خۆ نابەن!

**قەبوول ناکە تکاکاران**
**هەلاکم ئەز وەکی جاران**
**چ تەدبیر کین گەلی یاران**
**ل دەست خەلقێ هندستانێ**

ئەو چو هیڤی و رجایێ ژ ئێخسیران قەبوول ناکەن، لەو ئەز وەکی جاران یێ هەلاک بوویم، ڤێجا گەلی دۆست و یاران هوین بێژنە مە ئەم چ تەدبیر و رایێ بکەین، و چاوا خۆ ژ دەستێ خەلکێ هندستانێ رزگار بکەین.

مەخسەد ب خەلکێ هندستانێ چاڤێن دلبەرێنە، وی ئەو ب هندییان ڤە تەشبیهکرن ژ بەر دلڕەقی و ڕەشییا ڕەنگێ وان.

**ل هندێ تۆب د ڕەش هاتن**
**د رۆمیان خوەش دەرا لاتن**
**کەسێ کو بەر دوان کاتن**
**دزانی کوفر و ئیمانێ**

هەر چەندە هندەک ژ ڤێ مالکێ ب من باش نائێتە خواندن ژی، بەلێ ژ سیاقێ شعرێ دئێتە زانین کو شاعری دڤێت بەردەوامییێ بدەتە سالۆخدانا چاڤێن دلبەرێ یێن ڕەش ئەوێن بەری نوکە ژی وی ب هندییان تەشبیهکرین، و دێمێ وێ یێ گەش

ئـەوێ ل ڤـێـرێ ب رۆمییان ڤە دئێتە تەشبیهکرن، دبێژت: ژ هندێ تۆپێن ڕەش ب نک مە ڤە هاتن، و مەخسەد پێ چاڤێن ڕەشن. و مـەعنایا ڕێزکـا دویـێ و سـێییێ بـاش ل بـەر مـن یـا زەلال نینـە، چونکی د بنیات دا مە ب تمامی نەخواندییە، بەلێ دبت مەخسەد پێ دێمێ سپی و زەلالێ دلبەرێ بت یێ وەکی ڕەنگێ رۆمییان، دبێـژت: هـەر کەسـەکێ ڕەشـاتییا چاڤـان و گەشـاتییا دێمـی ب ڕەخ ئێک ڤە ببینت دێ فەرق و جوداهییێ د ناڤبـەرا کـوفر و ئیمـانێ دا زانت؛ چونکی کوفر یا ڕەشە و ئیمان یا سپی و گەشە.

و مەلایێ جزیری ژی هەر ل دۆر ڤـێ مـەعنایێ دزڤـرت دەمـێ چاڤێن دلبەرێ سالۆخ ددەت و دبێژت:

دو تالانچی د مەشهوور تێ ژ مەعدەن عەینی کافوور تـێ
د تێکل ظولمەت ونوور تێ مـە کـوفری دی د ئیمـانێ

یـەعنی: دو تـالانچییێن ناڤـدار ب تـالانکرنێ، کـو چـاڤێن دلبەرێنـە، دئـێن و مـە تـالان دکـەن، ژ وان چاڤـان (مەخسـەد پـێ سپیلکا وانە) کافوورێ سپی ب خۆ دەردکەڤت، و چونکی ب ڕەخ ڤـە تارییـەکا ڕەش هەیـە (مەخسـەد پـێ ڕەشـکا چاڤییـە) تـاری و ڕۆنـاهـی تێـکەلی ئێک دبن، و ب دیتنا ڤی دیمەنی مە کوفری د ناڤ ئیمانێ دا دیت.

مەخسەدا وی ئەوە ڕەشاتییا چاڤی بیرا مە ل کوفرێ ئیناڤە کو یا ڕەشە، و سپیاتییا چاڤی ژی بیرا مە ل ئیمانێ ئیناڤە کو یا سپییە.

**دزانـــى ظـولمـــەت و نـــوورا**
**حـــەوالێ زەنگـــى و حـــوورا**
**يـــەقين قـــانوون و دەســـتوورا**
**شـــريكن ئـــەو د تـــالانێ**

ئەو کەسێ وی دیمەنێ عەجێبێ چاڤێن ڕەش و دێمێ گەش ببینت، دێ فەرقێ د ناڤبەرا تاری و ڕۆناهییێ دا باش زانت، و دێ زانت کانێ چ جوداهی د ناڤبەرا حالێ زەنگییێن ڕەش و حوورییێن سپی دا هەیە، و مسۆگەر ئەو ب وێ قانوون و دستووری ژی ئاگەهدار بت یا کو د ناڤبەرا وان چاڤ و وی دێمی دا هەی کو ئەو پێکڤە و ب شریکاتی دلێ عاشقی تالان بکەن.

**ب تـــالان بـــر د دل ژارا**
**ئـــيلان و عـــەقرەب و مـــارا**
**مەفـــەر نينـــە گونـــەهكارا**
**وەكـــى ئـــەو تێنـــە طوغيـــانێ**

کەزی و بسکێن دلبەرێ یێن وەکی مار و دوپشکان دلێن فەقیر و ژاران تالان دکەن، و دەمێ ئەو مار و دوپیشک ڕادبنە سەر خۆ و دئێنە مە گونەهکارێن وەکی مە چو ڕێ نابن ژێ برەڤن، و خۆ ڕزگار بکەن.

و هەر وەکی وی دڤێت ب ڤێ گۆتنا خۆ (تەلمیح) و ئیشارەتێ بدەتە هندێ کو مرۆڤێ گونەهکار دەمێ دادهێلنە

د قەبری دا کارێ وی یێ خراب دبنە مار و دوپشک و دئێنی، و هنگی وی چو رێ نابت ژێ برەڤت.

**گونەهکارێ ل مێژم ئەز**
**دنالم هەر دبێژم ئەز**
**ژ چاوان خوون درێژم ئەز**
**و من را یار کە ئحسانێ**

ئەز گونەهکارەکێ کەڤن و ژ مێژەمە، و گونەهـا من کو ڤیانا وێ دلبەرێیە، یا نوییە، و ژ بەرێ وەرە ئەز نالنالێ دکەم و هەر گلە و گازندەیێن خۆ دبێژم و دبێژمە ڤە، ئەز خوینێ ژ چاڤێن خۆ درێژم کو یار قەنجییێ د گەل من بکەت.

**و من را یار کە ئەڤ دەنگە**
**پلنگی خوە و مەلەک ڕەنگە**
**ب لەب شەکەر ب دل سەنگە**
**دو زولفێ شوبهی رەیحانێ**

د بەرێ وەرە داخواز و هیڤییا من ئەوە یار دەنگی بکەت، و قەنجییێ ل مە بکەت، ئەو دلبەرا ب تبیعەتێ خۆ وەکی پلنگان دژوار و ب هەیبەت، و ب ڕەنگ و ڕوییێ خۆ وەکی فریشتەیان نازک و جوان، ئەوا ب لێڤان شەکر و ب دلی کەڤر، خودانا هەردو زولفێن وەکی ڕەشەرحانێ بێنخۆش و جوان.

**دو زولفێ شوبهی رەیحانن**
**مەدیم جیرانێ خالانن**

**هـــەر وەكـــی ماهــ و ســـالانن**
**ســـــەرییان دا بـــۆ نیشـــــانێ**

هەردو زولفێن وەکی رحانـان درەش و بێنخـۆش، بـەردەوام یـێ هـەڤـسـوی و جـیـرانـێـن نـیـشـانێن رەشێن دێمینـه.. و نیڤا دویـێ ژ مـالكێ ب تایبـەتی رێزكـا پێشـییێ ل بـەر مـن ب تمـامی یـا ئاشكەرا نینه، و دبت خەلەتییـەک تێدا هـەبت، و ژ سیاقی دئێتـه زانـین كـو مەخسـەدا وی ئـەوە: ئـەڤ هـەردو زولفـه ب نـک دێمـێ دلبەرێ یێ وەكی هەیڤێ گەش ڤـه دچـن، و سـەرێ خـۆ بـۆ نیشـانێ ددانن، دێ بێژی ئەو یێ بۆ وێ دچنه سوجدێ.

نێزیک ژ ڤێ مەعنایێ مەلایێ جزیری دبێژت:

| | |
|---|---|
| ل دێمـی سـونبولان سـەر دان | چەڤین سـەر سووسـن ووەردان |
| ل مـاهێ عـەقرەبان گـەر دان | د ســـەردان ئـابێ حـەیوانێ |

زولفێن دلبەرێ یێن وەكی سونبولان كۆمبوون و ب سەر دێمێ وەكی سووسن و گولان دا هاتن، و ئەو بسكێن وەكـی مـاران ل دۆر دێمێ وەكی هەیڤێ زڤـرین و گـەر دان، و سـەر دا دەڤ و لێڤـان كـو ئاڤا حەیاتێ د ناڤ دا هەیه.

**نشـــانێ بـــێ نشـــان كـــردم**
**ل عــەقل و هــۆش و فــام بــردم**
**ل عشــقت یــا حــەبیب مــردم**
**وەرن گـــوێ بدنـــه ئـــەفغانێ**

وان زولفان ئەز کرمە نیشانەکا بێ نیشان، یەعنی: وان ئەز ئەوێ ژ بەر زۆر و ستەما وان چو تێ نەمای کرمە نیشان و ئارمانج بۆ هێرشا خۆ، و وان ئەز ژ عەقل و هۆش و فامی برم، و سەروداسە کرم، و ژ بەر عشقا تە -ئەی خۆشتڤی- ئەز مرم، ڤێجا هوین -گەلی هەڤالان- وەرن گوهێ خۆ بدەنە نالین و هەوارێن من، دا ب حالێ من زانا ببن.

پشتی ڤێ مالکێ دو مالک هەنە بەلێ ژ بەر برینا کاغەزێ ئەو د بنیات دا دتمام نینن، لەو خواندن و شرۆڤەکرنا وان ب دورستی مە نەزانییە، و ئەوا هاتییە خواندن ژێ ئەڤەیە:

**وەرن گـــوێ بدێرنـــە نالینـــە**

**دوەســــتن (لاتوبالی)نــــە**

**... ... ... کینــــــە**

... ... ... ...

**چ رەنــک جۆبــار جــەیحوونی**

... ... ... ...

... ... ... ...

**دچـــی ب ئــاوێ شــەطیانێ**

د مالکا دووماهییێ دا حەریری دبێژت:

**حـــەریری بەســـکە هـــاوارا**

**ل چـــاوان بـــەردە جۆبـــارا**

**ل دەســـتێ فرقـــەتێ یـــارا**

**فغـــانم چوونـــە ئەســـمانێ**

ئەی حەریر، تو هەوار و فیغانان بەس بکە، و ژ چاڤێن خۆ جۆبارێن ڕۆندکان بەردە و ببارینە، و بزانە کو ژ بەر دەردێ فیراقا یاران قێژی و هەوارێن من هند بلند بوون حەتا کو گەهشتینە ئەسمانی.

# قەولێ هەسپێ ڕەش

ئەڤ قەولـە، یـان بەیتـە، هـەر چەنـدە ژ لایێ دیرۆکـێ ڤـە چـو ڕاستی بۆ نینن ژی، بەلێ ئەو ئێک ژ قەولێن زێدە بەلاڤبوو د ناڤ کـوردان دا، وان ئـەو وەک بەیتـەکا فلکلـۆری ڤـەدگێڕا، بێـی بـزانن کـانێ ئـەوێ ئـەو ڤەهانـدی کییـە؟ و کـەنگی ئـەو هاتییـە ڤەهانـدن؟ بەلێ مەلا مەحموودێ بایەزیدی بەری پتـر ژ سـەد و پێنجـی سـالان ئەو د دەستنڤیەکا خۆ دا نڤیسـییە و بـۆ عـەلییێ حەریری پالدایـە؛ چونکی ل جهەکی ئەڤ گۆتنە هاتییە:

ئـــەڤ خەبـــەرا ژێ گـــۆتی
عـــەلی حـــەریری ژی ســـۆتی

ژ بـەر وێ چەنـدێ بایەزیـدی ل پێشـییێ دبێـژت: (قـەولێ هەسپێ ڕەش حکایـەت عـەلی حـەریری نـام)، و ب ڕاسـتی دانـەیا بایەزیدی -وەکی ئاشکەرا- گەلەک لەنگی و کێماسی تـێدا هەنـە، و ل ڤێرێ ئەم وێ دانەیێ وەکی وێ دێ ل بەر چاڤ دانین.

هێژایی گۆتنێیە کو سەیدا محەمەد ئەمین ئۆسمان دانەیەک ژ (قەولێ هەسپێ ڕەش) د کتێبا خۆ (دیوانا مـەلان) دا بەلاڤکرییـە، و وەکی ئەو ل پێشییێ ئاشکەرا دکەت، وی دانـەیا خـۆ ژ کەسـەکێ ب ناڤێ (سەلمانێ ڕەشۆیێ شۆشی) وەرگرتییە، کو مرۆڤەکێ حـافز

بـوو، بـەلێ گەلـەک بـەیت و قـەولێن فلکلـۆری ژ بـەر بـوون، و سەیدایێ محەمەد ئەمین ژ سەلمانێ شۆشی ڤەدگوهێزت، کو ئەڤ قەولـە ژ دانانـا عـەلییێ حەریرییـە، و وی هنگـی ئـەو ڤەهانـدبوو، دەمـێ ئـەو هاتییـە شۆشـێ. و ل دویـڤ دانـەیا وی جهـێ ڕویـدانا قـەولێ هەسـپێ ڕەش شۆشـێ بـوو، وەکـی دبێـژت: ((یـا ئیمـامێ نـازدارە، تـو ڕابـە بکـە کـارە، ئـەز دێ ژ تـە ڕا بێـوو.. قەشـەک ل شۆشێوو، هەرە لالی قەشەیی ئەو ل گەل خویشکێوو..)).

ب ڤی ڕەنگی ئەو پێدا دچت، و سەرهاتی ب گشتی د دانەیا بایەزیدی و شۆشی دا وەکی ئێکە، بەلێ جوداهی ژی هەنـە، و ئـەو جهـێ نـاڤێ عـەلییێ حـەریری تێـدا هـاتی د دانـەیا شۆشـی دا نەهاتییە، و د دانەیا بایەزیدی دا جهێ ڕویدانێ یێ کفش نینە.

و هـەر کەسـەکێ ب سـەرهاتییێن سیرەتا پێغەمبـەری -سلاڤ لێ بن- ئاگەهدار بت دزانت کو ئەو ڕویدانا قەولێ هەسپێ ڕەش ل سـەر بناخـەیێ وێ هاتییـە ڤەهانـدن ژ لایـێ دیرۆکـی ڤـە یـا بـێ بناخەیـە، و ئـەو د چـو کتێبـێن حـەدیس و سیرەتێ یـێن بـاوەرێ دا نەهاتییە.

ئەڤـە و چـونکی ئـەڤ بەیتـە ژ لایـێ مـەعنایێ ڤـە زێدەیـە یـا روهن و ئاشکەرایە، مە چو هەوجەیی ب شەرحکرنا وێ نەدیت.

مـــــەجال ئـــــەو مـــــەجال بـــوو
كـــافرەک ديـــن بـــەطال بـــوو
هەســـپەكێ چـــێ[1] ل بـــال بـــوو

هەســــــپێ د نيــــڤ كافرانــــــە
بـــــــــەدەلی موســــــــــلمانە
موحەممــــــەد پـــــێ عەللامــــە

موحەممــــــەد دەنــــگ هشـــــينە
هـــــەرچی هەســـــپێ ڕەش بينـــــە
جلـــــدو[2] ژ مـــــن بســـــتينە

ئەصــــــحاب چــــــل پتــــــرن
حـــــەمی تێـــــك دفــــوكرن
مێـــــر ژ مێــــــران چێتــــــرن
ســــــرران ژ يـــــەک دگــــــرن

عومــــــەر ئبنــــــی خەطـطابـــــە
كوشــــــتن دا ئـــــو بابـــــە
نـــــــەخێرە نــــــە ثەوابـــــــە
(فــــــی الحــــــال) دا جەوابــــە

---

(١) چێ: باش.

(٢) مـەعنايا ڤـێ پـەيڤێ ب دۆرسـتی مـن نەزانييـە، و د دانـەيا سـەلمانێ شۆشی دا هاتييە: (قەسرەكێ ل بەحەشتێ ل من بستينت).

ئەو شۆلەکێ صەوابە
هەسپێ تە دڤێتن
دێ بچم ژ بۆ تە بینم
من جلدو نەڤێتن

عومەر ڤەدبێتە
عەلی ژ خوە فهێتە
من تشتەک نەڤێتە
عومەر سڤک وەکی با بوو
زوو ژ دیوانێ ڕابوو
د خذمەتێ وەستابوو

عومەر ڕابوو خوەشە
ل پشتێ بەس تەرکەشە[1]
چوو طەلبا هەسپێ ڕەشە

ب چۆل و چۆلستانێ
ل دەشت و بیابانێ
ئاژۆتە شارستانێ

ئەزم میرێ بەلاڤە
گەریا ل شارستانە

---

(١) تەرکەش (یان: تەرکش) تیردانکە، ئەو جهە یێ تیران دکەنە تێدا.

سووال كر پەنهانە[١]
ل قەشەی بوو میوانە[٢]
قەشەی گۆ: چ خەبەرە
مەرڤێ پێغەمبەرە
سەد جارا پێ خەبەرە

هاتمە ئظهار بکەم
سررا خوە گوفتار کەم
هەسپێ ڕەش کڕیار کەم

قەشەی گۆت: میوانم بەلاڤە
بها زەرێ خاڤە
چل تۆمەن دراڤە

قەشە گۆ: من دڤێتن
میوانێ من ببێتن

گۆ: ناڤێ مِن عومەرە
کڤشە نە بەزەرە
قاصدێ پێغەمبەرە

گۆ: هشە میر دبهیتن
سەرێ تە دبڕیتن

---

(١) پەنهانە: ڤەشارتی.
(٢) میوان: مێڤان.

زێڕ و مال دچیتن

گۆ: ئەز عوممەرێ سۆرم

شێرێ مەرتەب ژ ژۆرم

ژ سەرێ خۆ دبۆرم

د هەسپێ ڕەش نابۆرم

قەشە گۆ یا پا چ گۆتنە

سەر و مالێ منە

حەموو تێک بچنە

سەرم ب سەرێ تە ڕا

مالم ب مالێ تە ڕا

چیرم[1] بدەن ژ خوە ڕا

قەشە یارێ شەڕا

قەشە برایێ میر بوو

لەندهۆ[2] وەزیر بوو

پر ئەو ژ تەدبیر بوو

هەر د دیوانا میر بوو

قەشەی کچەک چێ ل بال بوو

جوانەکە ب کەمال بوو

---

(١) چیر: سەرکەفتن.

(٢) لەندهۆ، وەکی شاعر ب خۆ دبێژت، ناڤێ وەزیرێ میرێ کافران بوو.

ئەنی ژ خەط و خال بوو
ناڤێ وێ لێموون بوو

لێموونە لێموونە
سر لێ ظاهر بوونە
من دا تە ب یەقینە
هەرە ژ بۆ خوە بینە

مەجال ئەو مەجال بوو
کافرەک دین بەطال بوو
هەسپەکێ چێ ل بال بوو

لێموونێ ب لباس کە
ب کەفی و کراس کە
میوانم خەلاص کە

قەشە وەلەد هەبوونە
سڤکن وەکی کوونە
ب دیوانێ ڤە دچوونە

دیوانا کوڕانە
کافر تێ وەستانە
لەندهۆ و قەشە برانە
لەندهۆ گو میرم میوانە

ژ قەشە ڕا هاتیە قرێشە

مەجنوون بێتە پێشە
هەسپێ ڕەش دکەت تەفتێشە

میر گۆ قەشە برایێ منە
هنگی فەرکوڤن بگرن بکوژنە
دوژمنێ سەرێ منە
دەعوا هەسپێ منە

لەز کن بلەزینن
کێران بچەرخینن
خوونان ژێ بدەرینن

کێرێ د مۆکارن
ژ سەری حەتا خوارن
بگرن هوون یەک جارە

لندەهۆ گۆ میرم قەط ڤەنابن
قاصد ژ خوە تەرخانن
د نێڤ مە و وانن
عامی پێ دزانن
خەلات ل سەر ملانن

کو هەسپێ تە بدەتەرە
کوشتن چل میتەرە
ئەو خوە ژ عومەرە

میتەران چ دهشتە
گرێدان بەر و پشتە
ب دەڤ پێن دکوشتە

هەسپی تو یێ دزانی
کوشتن چل خۆیانی
خاسما ئەو بیانی

وەقتێ دێ ببینی
دەڤی تێ وەرتینی
ب تالان دشەقینی
زێڕ و مال بۆ مە دمینی

میر کو قەوی گەرم بوو
ب وان چیران نەرم بوو
ڕوو لێ زەر و سۆر بوو

گۆ: هەڕن بێژنێ بلا بێتن
ئەگەر دوێرتن بلا زین بکەتن
ل مەیدانێ لنگ بدەتن
هەروە ژ بۆ خوە ببەتن

ئەگەر دێ نەوێری
جەللادێ وی حازری
دێ خوە ل کوو ڤەشێری؟

قەشە و یۆلداشن
ب کەنی و تەماشن
ژ دیوانێ چوونە پاشن
خەبەر بر ئەو ل ئۆلداشن

گۆ: هەیهۆتە هەیهۆتە
میرێ مە قەنج گۆتە
هەسپێ خوە فرۆتە
چو بها نە گۆتە
ئەم شەڕکەرین ژ بۆ تە

عومەرێ گول گەشە
هەلینا تەرکەشە
مەشیا هەسپێ ڕەشە

عومەر چوو کۆلانێ
هەسپ ل طەولەخانێ
خوەش هاتە جەولانێ

عومەر چوو ژ دەر دا
یەنێ خوەند ژ بەردا
بۆری د گەل خەبەر دا

عومەری هەسپ ئینا دەرە
لێ کر زینێ زەرە
شداند تەنگ و بەرە

ل پشتێ کەت عوممەرە

چەند سەران دکڕینە

ل هەسپی دخوڕینە

ل سەر سوورێ دفڕینە

عومەر سوارەک سەر مەستە

کەت و شەط نەشکەستە

جلۆ ما د دەستە

کوڕان حەیف دخوەستە

عوممەر هەسپ دا مەیدانێ

یەک بوو ل وێ صەنعانێ

خەبەر ل کوو دانێ

قەشەئێ موسلمانێ

ل کوڕان بوو هەوارە

د برجان هاتنە خوارە

د گەل قەشەیی قالە

قەشەی شەڕ ب شیر کر

عوممەر شەڕ ب تەر کر

مەیدانێ ژ خوونێ تەڕ کر

قەشەی شەڕەکێ زۆر کر

ب مەعرێ موهۆر کر

مەیـــدان ژ خـــوونێ ســـۆر کـــر
عومـمـــەری شـــەڕەک خـــوەش کـــر
بیتریـــــت شـــــەش پـــــەڕ کـــــر
مەیـــدان تـــەژی لـــەش کـــر

قەششـــــــــەئێ وەحیـــــــــدە
مەرتەبـــــــــە تەوحیـــــــــدە
کـــــــوڕان کـــــر شـــــەهیدە

کـــــــــوڕان و فڕەنگـــــــــان
ڕم دانـــــــە بـــــن چـــــەنگان
ل عومـمـــــەر کرنـــــە دەنگـــــە

جیـــەک ب کـــوڕ و ئـــاڤ بـــوو
هەســـپێ ڕەش ژی خـــاڤ بـــوو
عومـمـــەر ژی ب خـــوە نـــاڤ بـــوو

عومـمـــــــەر دی وێ جـــــــارێ
دێـــــــرەک وێ ل بـــــــەرواری
قەصـــــد کـــــر چـــوو دیـــارێ

عومـمـــەر چـــوو ب دەشـــتێ دا
دێـــــــــــرەک دی د ڕێ دا
چـــــل راهـــــبن وێ تێـــــدا

گۆ: ڕەبەنۆ مرارۆ
ژ دێرێ ڤەدە خوارۆ
مە د دێرێ حصارۆ

کوڕان گۆ لا جینوونە
لەز کە لەز نینە
حصار د دێرێ نینە
دێرا مە ئاسێیە حصار تە نینە

عومەرێ سەرمەستە
هەلینا هەردو دەستە
دوعا ژ خودێ دخوەستە
دەرێ دێرێ شکەستە

عومەر ب خوە و هەسپی ڤە
هەردو چوون د دێرێ ڤە
دێرێ چل راهب د نێڤە

عومەری شۆلەک چێ کر
سەرێ چل راهبی ژێ کر
دەرێ دێرێ پێ ئاسێ کر

تیپێت کوڕان هاتن
ل دۆر دێرێ وەرهاتن
ل هەڤدو گەڕاندن

تیپێت کوڕان تێنه
ل دۆر دێرێ وەرتێنه

گەلەکێت د تاری
تیر تێن وەکوو ماری
پێ دکوژن کوففاری

ئینێ حەتا ئینێ
چۆکا ل هەلینێ
سۆربوو ژ خوینێ
جەواب چوویە مەدینێ
صەحابان گۆ: دا بچینێ

ئەصحابان گۆ: هێژ عومەر خوەشە
ب تیر و تەرکەشە
ل هێشەتا هەسپێ ڕەشە

صەحاب ڕابوون خاص و عامە
حەمی تێک هژیانە
دا بچینە تۆلانە

کوڕان و ب خەیلان
پفکرنە نەفیران
هاتینە شاهی میران
ژێ بین ئێخسیران

لەز کەن بلەزینن
زنجیران هوون بینن
ل دۆر دێرێ وەرینن
چار کەنا سەر هەلینن
عومەر ژ ناڤ دەرینن
بچنە سەر مەدینێ
نەهێلن بێن هاوەرینێ
بکرنە تالانێ
ئەصحابن کو کرین برینێ
ڕمێت قەصەب بینن دا بچینێ
با دەری مسلمانان
بەزینە جبەخانان
بینن سلاحێت شێران
جبەخانە ڤەکرن
خۆرە ذەرە دبرن
د بەر خوە و هەسپان دکرن
کۆما صەلەواتیانە
ئالایی ل بەر کەتینە
سەد صەلات ل نەبینە
کۆما سۆر و سپییە
ئالایی ل بەر کەتییە

سەد صەلات ل نەبییە

کۆما کەسک و سۆر و زەرە
صەحابە کەتینە بەرە
بەراهی پێغەمبەرە

ئەصحابە وێ هاتن
کافر ژ بەر هەلاتن
خودانێت بت و لاتن

ئەصحابە ڤێ قێننە
کافر ژ بەر هەلتێننە
دکەڤن صەف دشکێنە

هەڤهەڤا حەمزەیە
شۆر هنکێفەک زێدەیە
کافر دڕەڤن وەکی صەیە

هەڤهەڤا عەبباسە
خودانێ شۆرێ خواسە
کافر نەبوون خلاصە

هەڤهەڤا ئەبوو بەکرە
دێرێ چل راهب د نێڤە

خوەش خوە دوطنا کر
د کۆمێ دا کر

کۆم بەربا کر

هەڤهەڤا عوثمانە
هەر د دەڤی قورئانە
خودانێ شوورێ بەرانە
کافران کر ئەمانە

هەڤهەڤا سخوونە
ڕم وەکی سنوونە
چ کافرەک مەلعوونە

هەڤهەڤا هۆڤانیە
چ کافرەک خوون ئالیە

هەڤهەڤا بەختیارە
ژۆردا هات خوارە
چ کافرەک هارە

هەڤهەڤا نەذرە
وی د دەستان تەڤرە
هات ناڤێ پێغەمبەرە

هەڤهەڤا فەرفوورە
د دەستی دا شوورە
چ کافرەک ستوورە

هەڤهەڤا عەلییە

ل دلدلێ سپییه
د کۆمێ فرییه

وەکوو ئەوی دی عومەرە
ژ دێرێ بچنە دەرە
کافران د گەل موحەممەدی شەڕە

عومەر ژ دێرێ هاتە دەرە
ل بۆرێ شداند تەنگ و بەرە
دێ پشتی دکەت عومەرە

عومەر ژۆردا تێتن
فەرفۆری داڤێتن
چەندی دی دخێتن

گازییێ مێران تێ
نڕینێ شێران تێ

ئەڤ خەبەرا ژێ گۆتی
**عەلی حەریری ژی سۆتی**

عومەر و ئەصحابان
کافر بزداندین
پشتبەری مەرمەر وەرگەڕاندین
خاچ و پەیکەر د دەستا نەدین
عەلی کافر دبرین

د چـــــل چيـــــان وەردكـــــرين
خـــــاچ ژ خـــــوونێ چێكـــــرين
عـــــەورەكێ ڕەشـــــێ تـــــارى
بارانـــــــەك ژێ دبـــــــارى
ســوونـد نەكەڤـە ل عومـمـەر و عـەلى
ژ شـەهيدێت دەشـتا بـەدر و حونـەينێ

شعرا مەحبووبێ دەستێ خالقی ل سالا ١١١٠ مشەختی هاتییە
نڤیسین بۆ حەمزەیێ کوڕێ مەولانا عەلی
(ژ کتێبا مامۆستا قەرەداغی هاتییە وەرگرتن)

شعرا مەحبووبێ دەستێ خالقی ل سالا ١١١٠ مشەختی هاتییە

نڤیسین بۆ حەمزەیێ کورێ مەولانا عەلی

(ژ کتێبا مامۆستا قەرەداغی هاتییە وەرگرتن)

شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت

ژ دەستنڤیسا محەمەدێ کورێ مەسیحایی

كه مهمان جان جانانه

لسر چيتي مه مهمانه

به ما الا جملة خانه

كه شاهي جملة خان تيت

ووای شاهدي شيرين

ژعشقا ته دل اخسيرين

بجان منزل كهي ميرين

طلب كارين كه سلطان تيت

طلب كارين دل آرايم

مددم يارين بوي شايم

**شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت**

**ژ دەستنڤیسا محەمەدێ کوڕێ مەسیحایی**

**شعرا دلێ مەحزوون كفارەت بیت**

**ژ دەستنڤیسا محەمەدێ كوڕێ مەسیحایی**

**شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت**

**ژ دەستنڤیسا محەمەدێ کوڕێ مەسیحایی**

شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت

ژ دەستنڤیسا محەمەدێ کوڕێ مەسیحایی

شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت

ژ کەشکۆلا دیوانا جزیری

شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت

ژ کەشکۆلا دیوانا جزیری

شعرا دلێ مەحزوون کفارەت بیت

ژ کەشکۆلا دیوانا جزیری

شعرا هەچی شەیخ و موریدن

ژ دەستنڤیسا کەشکۆلا دیوانا جزیری

شعرا گەر هوون ببینن نارێ عشق

ژ دەستنڤیسا دیوانا مەلایێ جزیری

شعرا دیسان ژ نوو عشقا بەرێ

ژ دەستنڤیسا محەمەدێ کورێ مەسیحایی

شعرا خەلقۆ وەرن ببینن

ژ دەستنڤیسا کەڤن یا چو ناڤ و دیرۆک ل سەر نەهەین

شعرا خەلقۆ وەرن ببينن

ژ دەستنڤيسا محەمەدێ کوڕێ مەسيحايى

شعرا ڕوو بەر دەرێ جەببار بکەن

ژ دەستنڤیسا شێخ ئەحمەدێ فەقیرێ گوندشێخی

شعرا گەلۆ دلبەر وە بیر نایێ

ژ کەشکۆلا مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی

شعرا گەلۆ دلبەر وە بیر نایێ

ژ کەشکۆلا مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی

قەولێ هەسپێ ڕەش

ژ دەستنڤیسا مەلا مەحموودێ بایەزیدی

٨٩

صحابان کو دا بچینیه   اصحابان کو هیژ عمر خوشه   بتر و ترکه   بهشتا هسپی رشه

صحاب رابون خاص و عام   همی تنگ هشیار   دا بچینه توالانه   کوران و بخیلان

بقه کرنه نفیران   هاتنه شاهی میران   ژری ببین ابخیلان   لژکن بلزینی

زنجیران هون بینن   لدور دیری وربین   چارکنار سر هلبنی   عرز ناف وربنی

بجنه سر مدینی   نهیلین بین ها وربنی   بکرنه تالان   اصحابان کو کرین برینی

رمیت قصب بینن   کورهاتن دا بچینی   بادری مسلمانان   بزننه جه خانان

بینن سلاح میت شیران   جبه خانه نکرن   خوره ذره دبرین   دبرخوه و هسیان دکرن

کوما صلوات نانه   الای لبر کیتنه   صد صلواة لبنه   کوما حور و سیبه

آلای لبر کیتنه   صد صلاواة لبنه   کوما کسکه و حور وزن   صحابه کیتنه برخ

براهیم پیغمبر   اصحابه وی هاتن   کافر ژبر هلاتن   خدانیت بت و والات

اصحابه نحو خینه   کافر ژبر هلتنه   دکشن صف و شکینه   هف هفا حرقه

شور هنکیفک زنده   کافر درقن وکه صبه   هف هفا عبابه   خدانه شوری قواسه

**قەولێ هەسپێ ڕەش**

**ژ دەستنقیسا مەلا مەحموودێ بایەزیدی**

٥٠

کافرنبون خلاصه هف هفا ابوبکره شیره وکو مباره خوش خو و وطاکر دکومی داکر کوم بربا کر

هف هف عثمانه هرووکی قرأنه خداوشوری برانه کافران کراماته هف هفا سلحونه رم وکو سنونه

چه کافرک ملعونه هف هفا هوتی فسه چه کافرک خون آلسه هف هفا بختیاره ژوردا هات خواره

چه کافرک هاره هف هفا نذره وی دوستان نقره هات ناقی پیغمبره هف هفا فرفوره دکیشی دا شوره

چه کافرک ستوره هف هفا عمره لدلدو سپیه دکومه خزی به وکو اوی عمر ژدیری بجینه دره

کافران وکل محمد شره عمر ژدیری هاته دره لبوری شدانه لشکو بره دی پشتی دکت عمر

عمر ژوردا بیتی فرفوری دا قیتین چندی وی دخیتی لکازی میران -٢

زنیجه شیران نه افی خبرا ژی کولی علی حیدری ژی صورخ عمر و اصحابان کافر بزداندن

پشت بده مرو ورکراندن فاجه وبیکر دوستا ندبن علی کافر بردن وجل چیان ورد کرین

فاجه ژخوند جبکربه عمرکه رشی لازی بارانی ژی دباری صونه لکه لو علی ژ شهید بت دشا بدرو جنی

قەولێ هەسپێ ڕەش

ژ دەستنڤیسا مەلا مەحموودێ بایەزیدی

## ناڤەرۆك